سەرپەرشتی گشتی

شێرکۆ بێکەس

بەڕێوەبەری ڕۆڤار

دڵشاد عەبدوڵڵا

سکرتێری ڕۆڤار

یاسین عومەر

سەرپەرشتیاری هونەری

قادر میرخان

ڕاوێژکار

تاهیر ساڵح سەعید

مونتاجی کۆمپیوتەر

ئاسۆ سەعید


## ژمارەکانی ڕابردووی

1-ئیبراهیم ئەحمەد

2-محەمەد مەولود (مەم)

3-کەمال مەزهەر

4-لەتیف حامد

5-سوارەی ئیلخانی زادە

6-محێدین زەنگەنە

7-ئەحمەد هەردی

8-یەڵماز گۆنای

9-محەرەم محەمەد ئەمین

10-دڵدار

11-مەستورەی ئەردەڵانی

12-مەولانا خالیدی نەقشبەندی

13-جەمال عیرفان

14-مەلا عەبدولکەریمی مودەریس

15-جەلالی میرزا کەریم

16-ئیسماعیل بێشکچی

17-عەبدول خالق مەعروف

18-هێمن

19-حسێن حوزنی موکریان

20-ئەمین فەیزی بەگ

21-کامەران موکری

22-جەلال تەقی

23-حەمە ساڵح دیلان

## هەر کوردم



بەدەربەدەری یان لە ماڵی خۆم

لەخاکی عەرەب، لەئێران و ڕۆم

کۆک و پۆشتەبم، ڕووت و ڕەجاڵ بم

کۆشکم دەقات بێ، وێرانە ماڵ بم

ئازاو ڕزگاربم شادان و خەندان

یان زنجیر لەمل لەسووچی زیندان

ساغ بم جێڵ بم بگرم گوێ سوانان

یان زارو نزار لە نەخۆشخانان

دانیشم لەسەر تەختی خونکاری

یان لە کۆڵانان بکەم هەژاری

کوردم و لەڕێی کورد و کوردستان

سەر لەپێناوم گیان لەسەر دەستان

بەکوردی دەژیم بەکوردی دەمرم

بەکوردی دەیدەم وەرامی قەبرم

بەکوردی دیسان زیندوو دەبمەوە

لەو دنیاش بۆ کورد تێ هەڵدەچمەوە

## تێبینی

▫وێنەکانی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤار هەندێکیان لە ئەرشیفی تایبەتی و ئەوانیدیکەش لە گۆڤاری سروەو ئاوێنە و کتێبی ژیان و بەسەرهاتی عەبدولڕەحمان زەبیحی و بیرەوەرییەکانی دکتۆر ئاسۆوە وەرگیراون.

▫ ئەم ژمارەیە بە هاوکاری دڵسۆزانەی کاك عەبدوڵڵا زەنگنە و بە سوود وەرگرتن لە ئەرشیفی تایبەتی ئەو وەرگیراوە.

▫داوای لێبوردن لە خوێنەرانی بەڕێز دەکەین بەهۆی دواکەوتنی ئەم ژمارەیەی ڕۆڤارەوە.


(ڕۆڤار) بڵاوکراوەیەکی ڕۆشنبیرییە هەر ژمارەی تایبەتە بە داهێنەرێك

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم هەر دوو مانگ جارێك دەریدەکات



ناونیشان

سلێمانی -فولکەی یەکگرتن -دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ڕۆڤار ت / 3120690

لەدەرەوەی کوردستان Tel: 00441628477660 - Fax: 00441628486008

E-mail.

www.sardam.net\web mail

یان

dlshad7@yahoo.com



چاپخانەی (شڤان)

# لەمەڕ ژیانو بەسەرهاتی هەژار

**هەوراز گەرمیانی**

لەساڵی 1920دا بە ڕۆژێکی بارانو تووش لەمانگی جۆزەردانـدا لەدایکێکی شازدە ساڵەو بابێکی چلو هەشت ساڵە لە گەڕەکی خڕێ لە مەهاباد هاتوومە دنیاوە. باوکم مەلا بوو، بەڵام مەلایەتی نەدەکردو دووکانداریی دەکردو نیسبەت بەهاوەڵانی ئێمە موتەوەسیتولحال بووین. بەڵام ساڵێك کە لەتەمەنم رابرد، عەشیرەتی شکاك کە هاتوون، مەهابادیان لەچنگ عەجەمن دەرێناو خەڵکی شاریشیان تاڵان کردووە، ئێمەش هەرچی بوومانە، وەبەر تاڵان کەوتووە. تەنانەت لانكو دەسرازەی منیشیان بردووەو منیان لەسەر خۆڵەمێش فڕێداوە. بەڵام باوکم پیاوێکی بەغیرەتو نەبەز بوو. دیسان توانی لە کەسبو کاری خۆی ماڵ پێکەوە نێتەوە.

بەڵام من لەساڵی دووەمدا تووشی دایك مردن بوومو ژنێکی بێگانە بەخێوی کردووم تا ەتەمەنی چوار ساڵیمدا باوکم ژنێکی دیکەی هێناوەو کەوتمە دەستی زڕدایك. یانی من هەر لەمنداڵییەوە لە عەتفو میهرەبانیی دایك بێبەش بووم. ڕۆژگاری منداڵیم لەنو خۆڵو چڵپاو و قوڕی کۆڵانی مەهابادێ گوزەراوە. مەلعەبەو لیستۆکی من جگو مەڕمەڕو قۆچەقانی بووە. هەر لە تەمەنی پێنج ساڵید دەستیان پێ کردم بە خوێندنی سپیارەی قورئان، کە تەبیعی من کوردو ئەو عەرەبیو بەبێ مەعنا زانینیش بیخوێنمو ئەگەر کەلیمەییێکم لەبیر چووبایە، بەدار لێم دەدرا، یان مەعاشی ڕۆژانەم کە دوو شایی بوو، نەمدەدرایێ. بەڵام دوو ساڵ ئەگەر بڵێم سێ کەلیمە فێر نەبووم هیچ سەیر نییە.

ئەمجار ڕۆژێك باوکم دەستی گرتمو بردمیە لای مەلا رەحمان ناوێك کە قوتابخانەی هەبوو. ژوورێکی زەلامو رەشو تاریك، رووناکایی تەنیا لە کولانێکەوەو دەرگاوە بۆ دەهات. ئەگەر دەرگا دادەخرا، ئیتر وەك شەو وابوو. مەلا کە خۆی دەرسی دەگوت بەمنداڵان، ژنەکەشی، پوور ئامان، نانی دەکردو دەیفرۆشت. یانی هەر لە سبەینێوەڕا لە قوتابخانە تەندوور داییساو چڕە دووکەڵ بووت ئێوارە. هەر وەختە منداڵ دەچوونە دەر، هەموو چاومان سوور دەبوو لەبەر دووکەڵو فرمێسك ڕشتن.

باوکم لەپێشەوە، من لەدواوە چووینە ژوور. پاش سڵاوو چاكو خۆشی، باوکم دەستی منی گرتو دایە دەستی مەلا رەحمان گوتی: "ئەو کوڕەم هێناوە، پێی بخوێنی". مەلا رەحمان گوتی: "جا چۆنم دەدەیتێ؟"



-"گۆشتکەی بۆ تۆو ئێسکەکەشی بۆ من". یانی هێندەی دارکاری بکە، گۆشتی نەمێنێ. ئەو عیبارەتە گۆیا وەك ژن مارەکردنو سەوداکدن لازم بوو. ئەمجار مەلا رەحمان گوتی: "ساڵی دوو حەسیر، مانگێ قڕانێك، جومعەی چوار شایی هەقی ئاوخواردنەوە دەبێ بدەن". بەڵێ منیش هەر ئەو ڕۆژە حەسیرێکی تازەم هێنا. گورجێك پوور ئامین گوتی: "ڕۆڵەگیان، خۆم حەسیرت دەدەمێ، ئەوەی تۆ تازەیە، بۆ خۆم نوێژی لەسەر دەکەم"

بەڵێ دەستم کرد بەخوێندن. دیسان قورئانو وردە شتی وەك "سمایل نامە"و "ناگەهان" کە هەڕیمان لەبڕی نەدەکردەوە.

مەلا رەحمان کە لای سەروو دادەنیشت، نەیدەتوانی زۆر هەستێ لێمان بدا، ناچار داری تەڕی زۆر درێژی هەبوون، کە دەگەیشتە ئەو سەر ئەوسەری دایرەی منداڵان، کە نێزیکەی بیست کەس دەبووین. هەر کەس سەری هەڵێنابا، دەیکێشا بەملیدا. ئەگەر دەردەکەوت، پوور ئامان لەجێگەی ئەو نایبموعەلیم بوو. خۆ ئەگەر ئەویش چووبا بۆ نان فرۆشتن، ئەوا هەر یەکەی هەندێکی خۆڵ لەسەر ملمان ڕۆدەکردو دەڕۆیشت. واوەیلا بۆ کەسێك کە هەر سەر هەڵێنێو خۆڵ ڕژابێ! دار فەللاقەی هەبوو، دارێکی کەوانی، گوریسێکی لێ قایم کرابوو، لاقیان دەکردینە ئەو گوریسەو بایان دەداو بەدوو کەس هەڵیاندێناو بەشووڵی تەڕ تێی بەردەبوون تا جاری وابوو، دەخوێن دەهات.

کەیفی زۆرمان بەوە دەهات، کە لاقما ڕووت دەکردو تفمان لێ دەداو بە دەزوویێك پێیدا دەهاتین. مێش کە لە تفەکە دەنیشت، لاقی بەر زەووەکە دەکەوتو دمانگرت. ئەمجا پووشی حەسیرەکەمان لەقونگی ڕۆدەکردو بەرمان دەدا، وك تەیارەی

تەكاندەرە بڵێند دەبوو. بەڵام ئەو گاڵتەیە زۆر جار دەبووە مایەی لێدان و گریانمان.

تیشكی ڕۆژ لەو ژوورە تاریكەدا زۆر خۆشەویست بوو. ئەگەر نیوەڕۆیان لە كولانەكەوە كۆڵەكەیێك دەهاتە ژوور تۆزو دووكەڵی لێ دەهاڵا، دەمانویست بیگرین، هەرچەند لێدانیشمان بخواردایە، هەر پێمان هەرزان بوو. هاوین و پاییز لەوێم رابوارد. لە زستاندا كە بەفر زۆر باریبوو، ڕۆژێك لەپڕ دەنگی تۆپ و شێستیران هات. ئێمە كەمنداڵ بووین و دەستمان كرد بەگریان، هیچ، بەڵام مامۆستامان هەر ڕەنگ بەڕوویەوە نەمابوو، گوتی: "هەركەس بڕۆنەوە ماڵە خۆتان".

كەهاتمەوە باوكم زۆر كەیفساز بوو. گوتم: باوە، چییە؟.

گوتی: "ڕۆڵە، مەلا خەلیل كوردەو لەگەڵ عەجەمان شەر دەكا، وا خەریكە سابلاخ بگرێ". لەو ڕۆژەوە هەمیشە كورد خۆشەویستییێك بوو لەدڵدا بوو تا هات پەرەی ساندو نیشتمانی كورد بەو دەردو دەربەدەرییەی گەیاندم، كە ئێستا هەم.

لەبەهاری ئایەندەدا بابم خستمیە ناو حوجرەی فەقێیان و لای مەلا سەعیدێكی ڕیشدرێژ دایمەزراندم كە ئەویش عەرەبیی دەزانی، بەڵام نەیدەزانی نێوی خۆی بنووسێ. فێری نەببوو. ئاخر شەڕی مەلا خەلیل لەسەر كڵاو بوو، ئیتر مەلا خەلیل كە شكا، ئەمجار دەبوو مەلاو فەقێ ئیجازەیان پێ بێ كڵاو لەسەر نەكەن.

ڕۆژێك مەلا سەعیدی ریشدرێژی قەپۆز بەرانی چاوڕەق، لەگەڵ مەلا باییز ناوێكی خڕی ئەستووری گوێپان، لەگەڵ مەلا عەلییە كوێرەی بانگدەری مزگەوتی هەباس ئاغا كە كوێرێكی خڕوێلكاویی دەنگناخۆش بوو، لەگەڵ من، منداڵێكی هەشت ساڵانی. باریكی ڕیوەڵە مێزەرێكی بەسەرەوە ملی ڕێگەمان گرت بۆ ماڵی حاكم، كە ئیجازەمان بدا كڵاو لەسەر نەنێین.

مەلا عەلی بە تەقەی گۆچان و مەلاسەعید بە ورتە ورتی دوعا خوێندن گەیشتینە دەرگای ماڵی حاكم. تومەز ئەو دەرگایە دەرگای حەوشی تەویلەیەو داخراوەو قەت ناكرێتەوەو وەختیش جەنگەی گەرمای نیوەڕۆیە. حاكم نووستووە، ئێمەش بەگۆچان و بەرد بەربووینە دەرگای كە حاكم بیكاتەوە. ئیتر حاكمی فەقیر هەر شێت دەبێ، پێی وایە سابلاخ گیراوەو دەرگای ئەسپ و گامێش دەشكێنن. بەتای كراس و دەرپێ هات دەركەی كردەوە، گوتی: "پدر سوختەها چە میخواهید؟" ئێمەش بە فارسیە كێویلكەی مەلا باییز كە لە ترسان تفی قووت دەدا، پێمان گوت. هەر دوژمنی ئیمانت بێ چی پێ كردین! بانگی كرد: "وەرن بیانگرن". ئیتر هەر ئەوەمان پێكرا راكەین و مەلا عەلییە كوێرە بەجێ بێڵین. بەخوا هەر ئەو ڕۆژە بارمان كردو كتێب لەسەر شان بۆ خانەقای شێخ بورهانی.

جا حاكم لەپاشان گێڕابوویەوە، گوتبووی: "ئەگەر لەو دەركەیان دا، گوتم دەوری ماڵم گیراوە، كە دەچمە دەر، وا ڕیشێك و كوێرێك و منداڵێكی ساوا هەموو مێزەری سپی بە سەرەوە هاتوون ئیجازەی داوا دەكەن".

خانەقا جێگەی سۆفێتی و گەلێك لە موسوڵمانان وەك ڕاهیبی مەسیحیان موجەڕڕەدو تەركە دنیا لەوێ تاعەتێ دەكەن. هەروەها ژنی راهیبەشی لێ هەن. دەگەڵ ئەوەشدا فەقێ و مەلای لێ هەیە. بەڵام چ ژیانێك! تەواوی ساڵ نان و دۆ، ئەگەر هەبێ، دەنا نان بەتەنیا نانە جۆ.

لەو ڕۆژەوە دەستم كرد بەژیانێكی كە زۆرتری میللەتی كورد تێیدا دەژین، چونكە فەقێ لە كوردەواریدا لەدێهات یان لەشاران بودجەیێكی حكوومەتی نییە. هەر دێیەك یامحاڵێكی شار دەستەبەر دەبن مەلاو فەقێ رادەگرن تا عیلمی دین بخوێنن و خۆیان لەنانێكی كە بۆ خۆیان دەیخۆن و لەچێشتێ كە خۆیان لێی دەنێن بەشیان دەدەن. جا من كە لەتەمەنی نۆ ساڵیرا كەوتمە ناو فەقێیان بۆ عیلمی دین خوێندن تا تەمەنی حەڤدە ساڵیم لەناو تەبەقەی نەویی كورددا، كە ئەویش فەللاح و جووتیارن، ژیام. لەسەر سفرەی نان خواردنێ هەموو جەمێك نانی هەرزن و جۆو گەنم و گەنمەشامیت لە پەنایێك دەدیت. بروێش و برینج و نیسك و ساوار لیك كۆ دەبوونەوە. زۆر جاریش تەنیا لەگەڵ نانی ئیشكیدا دەكەوتینە ریشم بەردەو گێرەوكێشە. ئەوە نانمان، جا بۆ جل و پێڵاوو چامان، دەبوو خوێندن بەردەین، بكەوینە دێهاتی بێ فەقێ بۆ سواڵ كردن. گیسكێك لەوێ و قرشنێك لێرە، جلی ساڵێ تەئمین بكەین.

خوێندنیش بە زمانی خۆمان نییە، بەعەرەبی و بە فارسییە. هەر تەقێ لە سەرمانەوە دێ. فەقێیەتیم لەشاری مەهاباد و گوندی پەسوێ و ئیساكەندو وشتەپێ و تورجان و كەرمنداری ناو مەنگوڕان گوزەراند. ئەگەر لەكتێبی فەقێ كەم فێر بووم، بەڵام لەكتێبی تەبیعەتی سەراواڵ زۆر فێربووم. ساردو گەرمی دنیام چێشت. فێری ژیانی درشت و زبر بووم. ژیانی فەللاح و كۆچەری كوردو زوڵمی ئاغای گەورەو بەشخوراویی هەژارانم زۆر دیت، ڕۆحێكی تووڕەو تووشی تێدا خەلق كردم.

بەڵام لەناو ئەم ژیانە پڕ كوڵ و كۆیەو دەردو داخەشدا چەند جارێك بەداوی دڵداریشەوە بووم. دڵداریی زۆر بەتین و جەرگبڕ. ڕەنگە ئەگەر بڵێم سەد تەشم فرمێسك ڕشتبێ، موبالەغەم نەكردبێ، چونكە ئەو دوو-سێ جارەی كە عاشق بووم، هەمووی ئاخری دەگەڵ نائومێدی ڕووبەڕوو بووم. من فەقیر بووم و غەیری دەمو چاوێكی لەبارو جوان هیچی ترم شك نەدەبرد، كچ پێم رازی دەبوون و دەكەوتینە داوی یەكتر. بەڵام باری ژیان و قانوونی پیسی وڵات نەیدەتوانی باب و دایكی كچ و ئاغای دێ ڕازی كا كچیان بێ پارەو پێشكێش بدەن بە كەسێكی خۆشی دەوێ.

بەڵام كەلەبەدڵ گەیشتن لە عیشقی كچاندا بێبەش بووم، لەلایەكی ترەوە بەهرەم زۆر وەرگرت. جامی، شاعیری فارسی، دەڵێ: "كابرایێك چووە لای شێخێك، گوتی: دەبمە مریدت. گوتی:

هەرگیز ئاشق بووی؟. گوتی: نە. گوتی: بچۆ ئیشقبازی لەگەڵ کچێکدا بکە، با دڵت فێر ببێ چۆن موحیببەت وەردەگرێ" منیش لەو عیشقبازییانەدا وا دڵم ئامادەی موحیببەت ببوو، کە ڕۆژێك بیرم لە خۆشەویستی کوردستان کردەوەو قەرارم دا ئاشقی ئەو ببم و تا لە زنجیری ئەسیری رزگاری نەکەم، نەسرەوم. ئیتر ئیشقێکی راست و بەبڵێسەو بێ کەمایەسیم گرتە پێش. زۆر سوپاسگوزارم کە تا ئێستا نەجوانی و نەپارەو نەژن و نەشۆهرەت و نەئیحترام و نەترسی کوشتن و زیندان و لێدان نەیتوانیوە بامداتەوە لە عیشقی یاری خۆشەویستم، کە نیشتمانە.

تەمەنم حەڤدە ساڵ بوو کەبابم لە دێیێکی دوورە شاری، دوورە دوکتر بەزگێشە مرد. زەوییێکی دێمەکارو مانگایێك و دووبراو خوشکێك و زڕدایکێکی بۆ بەجێ هێشتم و سێسەد تمەنیش قەرزدار بوو. ناچار دەستم لە خوێندن هەڵگرت و هاتم ئەو میراتە پشتشکێنە بە شانی تەجروبە نەدیتووم هەڵگرم. لە خوێندنی ئەو چەند ساڵەدا تەنها فێر ببووم فارسی بخوێنمەوەو دەنکە دەنکەش عەرەبیم دەزانی، ئەویش لەکۆنە کتێبی دینی. جووت و گام نەدەزانی، ناچار زەوییەکەم دا بەئیجار بە سەت پووت گەنم.

هیندێکیشمان ناو ماڵی کۆن هەبوو، دام بەچوار بزن. ئەوانە هێندێك زیادیان کرد، خۆشم لەگەڵ شەریکێکدا هێندێ تووتن و بێستانم دەکرد. ساڵی یەکەم و دووەمی پاش مەرگی بابم زۆر ناخۆش رابرد. تەواوی زستان نەمتوانی کیلۆیێك پەنیر یان شیرێژ بکڕین. نانمان هەر بەویشکی بوو. دوای ساڵی هەوەڵیش زڕدایکم مێردی کرد. هێندێ زێڕی هەبوو بردی و ناوماڵیشی لێ ساندین و سێ منداڵی وردیشی بەسەر مندا هێشتەوە کە گەورەکەیان نۆ ساڵ و بچووکەکەیان ساڵ و نیو بوو. جا ئاسمان دوورو زەوی سەخت، من چۆن سەر دەرکەم؟ بەڵام مەنشوورە دەڵێن: "دڵ لە هەژاری ناپرسێ".

لەسەر ئەو هەموو نەدارییەو هەژارییەم کچێکم دیسان توانی خۆش بوێ. ئەو دێیەی ئێمە کوێستانە، سێری زۆرە، لەدێی دەوروبەرێڕا کچان دێن بۆ سێر کردن. لەناو ئەواندا یێکێکم دڵ گرتبووی، ئەویش منی خۆش دەویست، بڕیارم دا، بمدەنێ بیهێنم. بابێکی هەبوو، دزو پیاوکوژو ترسێنەر، کە چووم خوازبێنیم لێ کرد، گوتی: "دەبێ بێم ماڵت ببینم، بزانم چۆنە" گوتم: "هیچ مەیە، ماڵم هیچی تێدا نییە، ئەگەر تۆ کچ دەدەی بە مانگاو کەرەکانم، دەبێ ئەوان بێن لێت بخوازن. ئەوا ئەمڕۆ تۆ کچم بدەیتێ، ئەگەر سبەی فەقیر بووم، پێویستە لێم بستێنیتەوە. دەتوانم فێڵت لێ بکەم و بچم هێندێك بەڕە لە جیرانان وەرگرم و چەند بزنێك بێنمە ماڵە خۆم تادەیبینی، بەڵام من تا ئێستا سێ جار ناهومێد بووم، ئەوجاریش ناهومێد بم دوور نییە". بەخوا کابرا زۆر مەردانە گوتی: کچەکەم پێت رازی بێ، بەتای کراسی خۆی دەتدەمێ". کە بانگی



کردو لێی پرسی، کە ئایا مێردی پێ دەکەی؟ ئەویش هەر وەك کچێکی زۆر مۆدێرن گوتی: "بەڵێ زۆرم خۆش دەوێ، ئەویش نەبێ هەرگیز مێرد ناکەم".

ئەوژنە بوو بە مایەی دڵخۆشیم و لەبیربردنەوەی غەم و دەردی هەژاریم. کۆختە ڕەشەکەی تێیدا دەژیام بەوەوە ببوە بەهەشت. نانی ویشکی لەگەڵ ئەودا دەمخوارد پێم خۆشتر بوو لە خواردنی پاشایان. لەو ڕۆژەوە لە ژیاندا بزە کەوتە سەر لێوم کە ئەو مایە ژیانە، ئەو هەواڵە خۆشەویستەم کەوتە ناو ماڵەوە. لەسایەی ماڵدارییی ئەوەوە کە زۆر راهاتووی کارو بەمشوور بوو، توانیمان هێندێك تۆزێ نەداری لەشانمان بتەکێنین. تووتنی دەگەڵ دەکردم، زەوییەکەی دەدا بەشەریکی، پتری لێ پەیدا دەبوو، کڵاو، گۆریە، مەشکە، نان و کاری ماڵی هەموو بە ڕێکوپێکی دەکرد. ئاگای لە منداڵەکان دەبوو. وەك دایکی خۆیان بێ و زیاتریش. وردە وردە کەوتمە خۆشی و بووژانەوە. بەڵام ئایا زەمانە مۆڵەت و مەودا دەدا لەخۆشیدا بژیم؟

سێ ساڵ لەگەڵ ئەو کچەدا ژیام، بۆ چارەڕەشیم بە نەخۆشیی تیفۆ بەبێ دەرمان و دوکتر مرد. دیسان تاریکی پەردەی بەسەر ژیانمدا کێشایەوە. نەگبەت و نەهتی وەك برابەش هاتنەوە سەرم. ماڵم بۆوە بە زیندان ژیانم لێ بوو بەژەهری هەلاهیل. هەموو ئاواتم

ئەوەبوو کە منیش بمرم، وەدوای کەوم. بەڵام مردن بۆ بەدبەخت زۆر گران دەست دەکەوێ. خۆشەویسترین ڕەفیقی ژیانم لەدەست چوو، کەوتمە باری دەست دەئەژنۆ وەرهێنانو ڕمێسک هەڵوەرانی بێسوودو بەهرە. وام لێ هات، چاوم بەرایی نەدەدا، ماڵەکەم ببینم کە ئەوی تێدا نەماوە. جێگام لێ ببوە گیشەی دڕوو، نەمدەتوانی لێی بنووم.

هەمیشە تارمایی ئەوم لەبەرچاو بوو. ناچار بۆ چارەی ئەوە وام پێ باش بوو هەر لەو دێیە دوورکەومەوە، بەڵکوو لە بیرم بچێتەوە. چوومە بۆکان بە ماڵەوە. پارەی زۆری کابرایێکی بۆکانیش قەرزدار بووم، ئەویش لەترسی ئەوەی کە نەفەوتێ، پێنجسەد تمەنی دامێ، کەسەودای پێوە بکەم، بەڵکوو سەرکەومو پارەکەی بدەمەوە، منیش لەگەڵ یێکێکد بووم بە شەریکو دەستم کردە تووتن کڕینو فرۆشتن.

بەڵێ لەوە شانسێکی باشم هێنا. توانیم قەرزو قۆڵەم بدەمەوەو شتێکیش زیادیم هەبێ، کە پاش ساڵو شتێك لەبۆکان ژنێکی دیکە بێنم، کە ئێستا دایکی منداڵەکانمە. ئەوەم هەرچەندە بەدڵدارییێکی پێشینەیی نەهێناو هەر ڕێکەوتنێکی کتوپڕ بوو، بەڵام دیسان توانیی، کە برینی پێشوو سارێژ کاتەوەو دەردی مەرگی ئەوم تا ڕادەییێك لەبیر بەرێتەوە.

ڕاستی زۆر جاران دەڵێم، من کە لە هەموو شتێکدا بەدبەختمو ناۆشیم هاتۆتە ڕێو بەهەژاریو لەش بەباری ژیاوم، ڕۆژگار ئەوەندەی چاکە لەگەڵ کردووم کە لە دووژنهێناندا سەرکەوتوو و بەختیار بووم. هەر دووجار هەرگیز ئاواتم بەخەڵکی نەخواستووەو زۆر ڕازی بووم لە چارەنووسی خۆم.

نەخوازە دووکانەکەی لە مەهاباد جێ کۆبوونەوەیەکی ڕۆژانە بوو. زۆرجار باسی ئازادبوونی کورد دەکرا، بەڵام لە تەمەننا دەرنەدەچوو. ئەمنیش کەوتبووە دڵمەوە، کەبەڵێ زۆر خۆشە کورد بۆ خۆی ناو و نیشانێکی هەبێ، بەڵام نەمدەزانی کورد چۆن بێبەشە. مەسەلەن لە دڵی خۆمدا هەر پێم خۆش بوو کورد پاشایەکی هەبێ. بەڵام پێشم خۆش بوو پاشایەکی چکۆلووکەی جوانکیلە، کە بۆ منداڵان دەست بدا، بمانبێت. بەڵام باش بوو ئەو هەوەسو ئارەزووە هێنامییە سەر ئەوە کە کوردی خوێندنەوە فێر بم. لەبیرمە منو زەبیحی هەردووکمان زۆر کەم سەودای فارسیمان هەبوو. هەوڵمان دا بۆ کتێبێکی بەناوی "ئەنجومەنی ئەدەبیاتی کورد"مان پەیدا کردبوو، لەباغەڵمان دەناو دەچووین نێزیك پردی سوور، لەپەنا ئەشکەوتێك دەمانخوێندەوە، باشمن بۆ نەدەخوێندراوە. دێتە بیرم لەسەر شیعرێکی شێخ ڕەزا، کە دەڵێ:

خزمینە، مەدەن پەنجە لەگەڵ عەشیرەتی جافا
مێرووله نەچێ چاکە بەگژ قوللەیی قافا

ئەمە خوێندمانەوە: "مێرووله لەپخێ چاکە بە کوسر قوللەیی قافا". ئەمن دەمگوت، ئەوە وانیە چونکە لەنگە. زەبیحی دەیگوت: "لەنگو مەنگ نازانم، بەڵام مەعنای چییە؟"ئینجا قەرارمان دا، کەلەباوکم پرسم. کتێب لە باغەڵدا بە زۆر ترسەوە، چونکە باوکم قەبووڵی نەدەکرد بێجگە لەدەرسو دەوری خۆم خەریکی شتێکی دیکە بم. شەوێك بەترسەوە لێم پرسی: "بابە، ئەگەر شتێکت لێ پرسم تووڕە نابی؟" گوتی: "نا".

کتێبە بۆرەم لە باغەڵم دەرێنا و شێعرەکەم لێ پرسییەوە. پاش ئەوە زۆر پێکەنی، بۆی ڕاست کردمەوە و گوتی:" ئەگەر پێت خۆشە ئەوانە بخوێنیتەوە، هەستە لەگەڵم وەرە". چووینە ناو حەوشەکەمانەوە. هێندێك عەرزی هەڵکۆڵیو سندووقێکی چکۆلەی ئاسنی کە جێی فیشەك بووە، دەری هێناو تەکاندیو باوەشێك کتێبی لێ دەرخست. دیوانی نالیو مەحویو کوردیو حەریقو شێخ ڕەزاو گەلێك شاعیری تێدا بوو. ئەنجا شەوانە من بۆم دەخوێندەوە. بۆ خۆی زۆری لەبەربوو. بۆ منیشی ڕاست دەکردەوە. ئەگەر لە خوێندنەوە خەلاس دەبووین، دەیخستەوە ناو قووتووەکەو دەیناوە جێگای خۆی لە حەوشەکەو گڵی وەسەر دەکرد. هەموو شەوێ ئەو کارەمان دەکرد.

لەو خوێندنەوانەدا باش فێری خوێندنی کوردی بووم. ئەوجار چەند کەسێك هەبوون کە کتێبی عێراقیان بۆ دەهات، دەیاندامێ. شیعری حاجی قادری کۆییو مەلای جەزیری، شێعریانم لەبەر کردبوو. هەروەها گەلێك سروودو شیعری میللی ترم هاتبووە بەر.

منیش کەوتبوومە دێهات بۆ فەقێیەتی. ڕۆژێك لە دێی وشتەپە کە دەمخوێند، کاکە ڕەحمانی حاجی بایز ئاغا، کە ئاغایەکی ئەدیبە، هات سەری حوجرەی فەقێیانیدا. لەوێ باسی شیعری خۆش کرا. چەند شیعرێکی عەرەبیی خوێندەوە لە بابەت غەزەلو فیراقدا. پاشان گوتی:" ئەدی ناتانەوێ شیعری کوردیتان بۆ بخوێنمەوە؟" کە دیتی پێمان خۆشە، تەرجیعبەندێکی بۆ خوێندینەوە کە خاڵەمینی قسقەڵایی داینا بوو. نازانم، چەندی تەسیر لە ڕەفیقەکانم کرد، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە منی هەر شێت کرد. هەموو گیانم دەلەرزی، گەرم داهاتبووم وەك نۆبەتێیەکی گەورەم هاتبێتێ. هەر غارم دا کاکە ڕەحمانو دەستم ماچ کرد، کە لێم گەڕێ بینووسمەوە، گەتی:"سوێندم بۆ خاوەنی خواردووە، کە نابێ کەس بینووسێتەوە، چونکە دەترسێ دەستی دوژمنان کەوێ".

کە لەو ناهومێد بووم، هەر بەیانی ملی ڕێگام گرت بەرەو قسقەڵا، کە ڕێگای سێ ڕۆژ بە پێیان دوورە. جارێ بە دوو ڕۆژ گەییمە سابلاخ. لەوێ پێیان گوتم خاڵەمین لێرەیە. گەڕامو گەڕام تا لە حەوشی مزگەوتی ڕۆستەم بەگ دیتم. بە چاوێکی پڕ لە گریانو لالانەوە گوتم:" دەغیلت هەڵوەدای ئەو شیعرانەی تۆم، بمدەرێ". بەخوا خاڵە مینم خاڵەمین بێ، حاشای کرد کە کردی:" گەزی چیو

کاکە رەحمانی چی؟ بابە، وەڵڵا نە من شێعرم هەیەو نە هیچ. چۆن پیاو هێندە شێت دەبێ، سێ رۆژە رێ دوای شیعر کەوێ، ئەویش شێعری قاچاخ. بڕۆ بڕۆ، مێشکی خۆت دەرمان کە". بەخوا دەست لە گون درێژتر دیسان گەڕامەوە.

ئیتر زۆری پێ نەچوو، کە بابم مردو من دەستم لە خوێندن هەڵگرتو هاتمەوە دێیەکەی ماڵی خۆمان، تەرەغە. تەقریبەن لە دنیا بێخەبەر بوومو لە گێرەوکێشەی نان پەیدا کردنم تووش ببوو. بەڵام خەیاڵی ئەو شێعرانە لە سەرم دەرنەچوو. ئینجا کە ئەوانم دەست نەکەوت، بۆ خۆم خەریك بووم. ئەمنیش تەرجیعبەندێکم لەسەر ئو وەزنە دانا و بەقەدەر ئەو، بۆ دوو کەس لە رەفیقەکانی خۆشم خوێندەوە، زۆریان پێ خۆش بوو. یان لەبەر خاتری من گوتیان باشە. بەڵام دەمزانی شێعری من نەگەیشتۆتە دەیەکی شێعری خاڵەمینیش بۆ مەعنا و رەوانی و سینعەت، لە داخا وەك زینەکەی ئەبوو زەید سووتاندم. مەلا رەحمان ناوێك هەبوو، برادەرم بوو، دێیەکەشیان نێزیکی دێی ئێمە بوو. ئەو لە سێوەدینو ئێمەش لە تەرەغە. جاروبار سەری دەدامو منیش دەچوومە لای. ئەو کوڕێکی زۆر دڵسۆز بوو، زۆر کەسی بە بیری خۆیەوە گیر کردبوو. دڵخۆشیم بەو بوو. کە یەکترمان دەدیت، داخو دەردو کوڵو کۆی زەمانەمان پێکەوە دەڕشت.



رۆژێك چوومە بۆکانو شەو هاتم لە شێخلەر، لە ماڵە کاکە رەحمان مێوان بووم. شەو باسی شێعر کرا. ئەمنیش گوتم:" رەفیقەکم هەیە، شاعیرە، بەڵام نایەوێ کەس نێوی بزانی، هێندی شیعری گوتووە. من پێم باش نین، پێم وایە بەکار نایەن، پێم گوتووە دەرینەخا". چەند دەنکێکم لێ خوێندەوە بۆ کاکە رەحمان. سبەینێ کە هەستام بڕۆمو کاڵەم دەبەست، گوتی: بە سواری دەتنێرمە ماڵێ، نۆکرێکیش لەگەڵت دێ، یان ئەو شیعرانەی هەموو بۆ دەنووسینەوەو دەیدەیێ، یان هەر لە ماڵت دەبێو نانت لەسەر دەخواو نا و جوت لێ دەستێنێ بۆ ئەو دوو ئەسپانە بەو زستانە، هەرچی دادم کرد، بێفایدە بوو، بەڵام سوێندی خواردو کە هەرگیز ناوم ناهێنێ. کاکە رەحمان شێعرەکانی لەبەر کردبوو، لە هەموو مەجلیسێك دەیخوێندنەوەو هەرچی دەیبیست، دەینووسییەوە تا وای لێ هات پێش ئەوەی من بگەمە سابلاخ گەلێك لە رەفیقان نووسیبوویانەوە.

ئەوێ شەوێ چوومە قاقڵاوە. لە ماڵە فەللاحێك میوان بووم. رۆژێ دواییش هەرچەند زۆریش وەڵات قوڕ بوو، منیش هەر کەوشم هەبوو، گەیشتمە دێی مووسی کە مەودایەکی زۆر دووری هەیە. شەو لە ماڵی سۆفی سادیق ناوێکی میوان بووم. بۆ سبەینێ کە دەبوو لە کوێستانی گەورەی گوڵەزەردە سەرکەوم، گوتیان:" خەتەرەو ئەوڕۆ کرێوە دەبێ" چوار تمەنم دا بە کابرایێ لەگەڵما بێ. بەراستی تەهلوکەڕێیەکی عەجایب! نە من چاوم هەڵدەهات لەبەر کرێوە، نە کابرای بەڵەد. بەڵام ئەو زۆر بەڵەد بوو، من دەستم دە قایشی پشتێندی ئەو گرتبوو دەیکێشام.

نێوە ڕاستی کوێستان پتر لە حەفتا کەس هەموویان مابوونەوە، رێگایان دەرنەدەکرد. کابرای بەڵەد گوتی:" وا ئەو فەقێیە دەبەم تا سەرێو دێمەوە شارەزایی دەکەم". لەو دیوی رەشانگێك هەبوو. کابراکە گەڕاوە. بایێکی توند دەهات. سەربەرەو ژێر رامان کرد. کڵاوەکەم بە چڵی دارێکی دارستانەوە مایەوە، ئاوڕم لێ نەداوە، گوتم:" هەموو شتێکم لە دەست چوو، با ئەو کڵاوەش بۆ تۆ بێ". چوومە دێی بەردەڕەش لە ولاتی بانە. لە ماڵێك لام دا کە دوو ژنو کچێکی لێ بوو. دیتنی ئەو جوانانە ماندووی چەند رۆژەی حەساندمەوە. لە هەرە جوانە نازدارەکانی کوردستان بوون. پاش گەرم بوونەوە هەر ئەو رۆژە بە تەنیا و بە نابەڵەدی چوومە دێیەك، سەرتەزێن. لە ماڵە حاجییەك میوان بووم. حاجی قسەخۆش بوو، زۆر سەغی بوو. پێنج شەش میوانی تریشی هەبوون، شەوێ جلی پێ داکەندین، تێی وەشاند، بەیانی کە هەستان نوێژ بکەن، گوێم لێ بوو حاجی گوتی:" ئەو فەقێیە هەڵمەستێنن، من پێم وایە کەمتر فێری نوێژ کردنە". کە لە خەو هەستام حاجی جووتێك کاڵەی بۆ هەڵبەستبووم، چۆغە کۆنێکی دە لاقمەوە پێچا و بە کابرایێکی ئەسپاردم کە لە رێگا ئاگای لێم بێ. ئەو رۆژە لە رێگا بەفرێکی زۆر

قورسمان لێ باری. شەو چووینە دێیەك. سیاوما، لەناو جەنگەڵی چوغڵودایە لە بانە. فەقێ بووم، پێشنوێژیم بۆ کردن. زۆرم دوعا بۆ خوێندن.

شەو دانوولەی گەنمو نانی هەرزنیان هەبوو بۆیان هێنام سبەی بەیانی نوێژم بۆ کردنو نووستمەوە. چێشتەنگاوو هەستام لە خەو، دیتم ئەهلی دێ هەموو دەورانەدەوری دیوەخان دانیشتوون. گوتیان:" فەقێ، زۆرمان نوێژی تۆ وەبەر دڵی کەوتووە.؟ ئەگەر لێرە بمێنی، زەکاتت دەدەینێو پێنج بزنت دەدەینێ، دوی بخۆو کاریلەکانی بۆ خۆت. بچۆ لەسەر ڕێگای کانیش ڕاوەستە، کچی هەر کەست پێ جوان بوو، لێت مارە دەکەین، مەلای ئێمە بەو بە منداڵمان بخوێنە".

بە خوا هەر بە هەزار کێشە لە دەستیان خۆم ڕزگار کرد. ئەو ڕۆژە چووم بەرەو چووم بلەسەن، هێند بەفر باریبوو، لنگم نەدەگەیشتە سەر عەرز. ڕێگا تەڕ بوو، شوێن نەبوو، نابەڵەد بووم، دە پاشنوێژێکی درەنگدا شوێنی ڕاو کەرانم دیت، پێیدا ڕۆیشتم، چوومە ناو دێی بلسەن، ماڵە کوێخا. پاشان یێك هات، لاقو کاڵەی لە بەفر ماڵیم، گوتی:" ڕەنگت وا زەرد بووە پێم وابوو ئێستا دەمری".

ئەو شەوەش چوومە مزگەوت. سبەینێ دوو چێوداری عێراقی بزنیان پێ بوو، دەچوونەوە، ڕەگەڵیان کەوتم. دەبوو ڕێگا بۆ بزن بشکێنین. تا پاشنوێژ هات لە گیان بووم. لاقم سەرمای بوو. گوتم:" من دەڕۆم". ڕێگاێیکیان پێ گەتم کە من باشی تێنەگەیشتمو دوای جۆبوونەوەم لەوان ڕێگام لێ گۆڕا هێندێك لەو کێوە چوومە خوار، لە دوور ڕەشایی دێیەکم بەچاو کرد. پێم وابوو ئەوە ئەو دێیەیە، کە ئەوان دەڵێن. سەر بەرەوژێر بێ ڕێگا بەناو دارستاندا ڕوو بەدێ ڕۆیشتم، بەڵام پاش سەعاتێك ڕۆیشتن کەوتمە ڕەشانگێك کە بەفری لێ چووبۆوە. قوڕ بوو، لەوێ هەڵخلیسکام تا گەیشتمە سەر بەردێکی پان، خۆم گرتەوە.

کە ڕوانیمە لای خوارووم هەزار بە هەزارێکە پیاو لێی دەتۆقێ. وا دێتە بەر زەینم بەقەدەر خانوویەکی دووقاتی دەهاتە بەرچاو. یێك پارچە بەردی لووس بوو. لاقی منیشی لێگیر نەدەبوو. لەوێ مامەوە. زۆرم هەوڵدا بگەڕێمەوە. لە قوڕەکە نەدەکرا سەرکەوم. بە چنگەکڕکە سەردەکەوتم، لەپڕ هەڵدەخلیسکام، دەهاتمەوە سەر بەردەکە. ئەگەر ڕاوەستابام تا تاوپەڕو قوڕ بیبەستایە بۆ خۆم ئەگەر لە سەرمان نەمردبام، ورچ دەیانخواردم. هەستیشم کرد کە لاقم سەرما بردوویە.

هەرچی بیرم کردەوە، هیچ چارەم نەدی غەیری ئینتیحار. گوتم:" لەو بەردە خۆم هەڵدێرم، دەمرم... جار بە حەهەننەم. بۆچی پاش من شەوو ڕۆژو بەهارو هاوین نایە؟" بە خوا لە پێشدا بوخچەی کتێبو گۆچانەکەم هاویشتە خوار. ئوجا قوونم دایە سەر بەردەکەو لاقم شۆڕ کردەوەو چاوم قوچاندو لەو حەوایەڕا خۆم هەڵداشت.

بەڵام نەمردم. چونکە بە شەش- حەوت میتریش لە خوارەوە بەفر بوو کە با ڕنیبوویە شیوو دۆڵی ئەو بەردەوە. بەڵام کە چاوم هەڵهێنا، وەك لەناو چاڵاوێکی قووڵدا بم، وابوو. جێگام لە بەفرەکە قوپابوو. ئەمجار بە پەلەقاژە ڕەبەرووی خۆم بەفرم دڕیو لە جێگەیێك سەرم هێنا دەر. گەڕام، جێگەی بوخچەو گۆچانیشم دیتەوە. دەستم وا چوو بوو، گۆی نەدەکرد. چوومە بڵندایییێکو ڕوانیم جێگەیێك لە بەفر قووپا بووو زانیم جۆگە ئاوە. بەوێدا ڕۆیشتمە نێزیك دێ.

دوازدە سەگی دێو ئەویش سەگی ئەو دارستانەو بۆم هاتنو دەوریان دام. منیش هەرچەند دەستم زۆر چووبوو، بە گۆچانەکەم دیفاعم لە خۆم کرد. بەڵام ئەوان زۆری منیان دەبردو وەخت بوو پەکم بکەوێ. لەو دەمەدا کوڕێکی جحێڵ بە بێڵەوە هاتە هاوارم خەلاسی کردمو چوومە دێ. دێ هەشت ماڵەو مزگەوتیشیان نەبوو. چوومە ماڵی کوڕەکە. هەر خۆیو خوشکی بوو، ماڵی تاریكو تەڕ، لاقیان گەسك دامو ماستیان بۆ هێنامو چای بە کشمیشیان بۆ لێنام. ئەو ئەنجینەی سەخت ناویەتی. بەڵام لە هەموو سەیرتر من لەو حاڵەدا بووم، لەو دەمەدا کچێکی کراس سووری بە سیلسیلە وفلفلە هاتە ژوورەوەو گوتی:" وەستا هاوێنەو بریقەت پێیە؟". بریقە مەقسوودی بریقەی دەسماڵان بوو. پێی وابوو من جوولەکەی وردەواڵە فرۆشم. کوڕەکە گوتی:" های ڕە زگت نێم، هەڕێ وەڵلاً، ئەوە مەلایە، خۆ جوولەکە نییە". ئەمجار پاش ئێوار بوو، کوڕەکە ڕێگەی نیشان دام. چوومە ئەنجینە کە لەسەر حدوودی عێراقە.

لە قەراغ دێ لە منداڵێکم پرسی:" ماڵە خەلیفە ساڵح لە کوێیە؟" (ئەوە کوڕی ئەنجینەی سەخت پێی گوتوبووم). منداڵەکە وەڵاغی دەبردە سەر ئاوێ بەجێی هێشتن، گوتی:" لەگەڵ من وەرە". کە چووینە حەوشێ، هاواری کورد:" بابە، میوانێکی دیکەشم بۆ هێناوی!" بابی گوتی:" ئافەریم،ڕۆڵەم، مێوژت دەدەمێ هی دوو میوانان". ئایا ئەو سەخاوەتە لەناو چ میللەتێك دەست دەکەوێ، بە کوڕت بڵێی:" بەرتیلت دەدەمێ میوانم بۆ بگێڕمەوە؟" چونکە هەموو کەس میوان ڕادەگرێ.

چوومە ماڵە خەلیفە ساڵح. میوانێکی تری هەبوو. زۆری پێ نەچوو ڕەفیقە عێراقییەکانی منیش هاتن. ئەو شەوە جلیان بۆ تێ وەشاندین. سبەینێ کەوتینە ڕێ لەگەڵ عێراقییەکانو چوومە سەر چۆمی ئەنجینە کە خەتی فاسیلی عێراقو ئێرانە. چۆم سەهۆڵ بەستبووی، بەبەرد شکانمان. ڕێگەیێکی چکۆلەمان تێکرد بۆ بزنەکان. هەوەڵجار من پەڕیمەوە. کە گەییمە ئەوبەر ئاگرم کردەوە.

وەختێ لە خۆم ڕوانی، وەك چەکمەی سوورم لە پێدا بێ، هەموو لاقم شتڵی خوێن ببوو. ئاوە ساردەکە بڕیبووی. شەو چووینە کۆخێکی لە قەراخ مەزرای ورچەك، کە ئەو کۆخە هی مێردو ژنێکی جحێڵ بوو بە تەنیا لەو چۆڵە ماڵیان کردبوو. بۆ سبەی چووینە دێیەك. ناوی بێواران بوو. بەڵام کە چووین نوێژی شێوان بوو. دیتم

دێ ئالۆزاوەو خەڵك ماڵاتی خۆیان رادەگوێزن. گوتیان:" ئێوە لێرە مەبن، ئەوشەوە عوشیرەتی پشدەری دێن، تاڵانمان دەکەن". " کوڕە، ئەدی حکومەتی عێراق؟" گوتیان:" بەخوا پۆلیس بەشەو وەدەر ناکەون ئەگەر هەزارمان لێبکوژن، بەڵام بە ڕۆژ مومکینە ئەوانیش بێن و هاواری شێخ لەتیفیشمان بگاتێ".



ئێمە چووینە مزگەوت، روانیمان مەلای دێ کە ناوی مەلا عەزیز بوو، خەڵکی ترساندووە، دەڵێ:" هەڵێن"، چونکە بۆ خۆی مەڕو بزنی زۆر بوو، دەیویست دەربازیان کا. گوتم:" ئێوە چەند تفەنگتان هەیە؟" گوتیان:" سێزدە". "چەند فیشەك؟" "دوو سەد". گوتم: دەسا تفەنگێك و بیست فبشەك بدەن بە من و کێهەلا زۆر خەتەوە تەسلیمی منی بکەن. ئەگەر تا سبەی هێشتم کەس لەلای منەوە بێ، بمکوژن. ئێوەش دیفاع لە هەر چوار لاوە بکەن تا سبە".

شەجاعەتیان کەوتە بەر، گوتیان:" لەت و پەتیشمان کەن، خانووان بەجێ ناهێڵین تا لێمان بسووتێنن. یا ئەڵڵا، کورگەل، مەلا عەزیز ترسەنۆکە، با بۆ خۆی هەڵێ". بەخوا ئەو شەوە بۆ کێشکی دێ دانیشتین، بەڵام کەس نەهات شەڕی لەگەڵ بکەین. سبەینێ پلاو و ساوارو چای ئاشی پێ دەکەرا، هێندەیان قەدر گرتین. ئەو ڕۆژە چووینە کەناروی، کە دێیەکی شێخ لەتیفە. لە ماڵی یەك لە بزنفرۆشەکان میوان بووم. شەو لە مزگەوت نووستم. بەیانی پێش نوێژی سبەی کەوتمە ڕێ بەرەو سولەیمانی. کە سەرکەوتم لە ئەزمڕ (کێوێکە) سولەیمانیم لێ دەرکەوت. کەوتمە خەیاڵات و بیرکردنەوە. "خوایە چ خەونێکە دەیبینم؟ من چەند ڕۆژ لەوەپێش ساحێب ماڵ و خانوو و ژن و منداڵ بووم، ئەمڕۆ وەك تازە هاتبمە دنیا، هیچ شك نابەم و کەس ناناسم، دەبێ چۆن بمۆ چۆن سەر دەربێنم؟" بڕیارم دا کەبچمە مزگەوتان و ببمە فەقێ وك قەدیم. بەڵام لە قەراخ شار گوتم: سبەی دەبمە فەقێ". لەناو شاتر لەکابراییێکم پرسی: "مێهمانخانە لەکوێیە؟" گوتی: "بلێ هوتێل، دەنا پۆلیس بزانێ ئێرانیت، دەتگرێ". بردمی، هوتێلێکی پێ نیشان دام.

شەو چوومە قاوەخانە، لەپڕ کەوتەوە بیرم کە من ئاشنایەکی خەڵکی پێنجوێنم هەیە، پێنجوێن بە بوومەلەرزە تێك چووە، خەڵکەکەی چوونە شارانی تر. دەبێ ئەو ئاشنایەم لێرە نەبێ؟ لەیەکێکم پرسی: "ئەرێ مەلا عەبدوڵڵا فەقێ پێنجوێنی شاعیرێکە لێرەیە؟" گوتی: "بەڵێ، دووکانی لەسەرجادەی تازەیە". شەو چوومە حەمام و سبەی لە دووکانێکی کتێبفرۆشم پرسی. دووکانی مەلا عەبدوڵڵای فەقێیان پێ نیشان دام، سلاوم کرد، نەیناسیم. گوتی: "بەخێر بێی، چۆنی؟ منداڵ چۆنن؟ براژنم چۆنە؟ بارەکەت فرۆشت؟" گوتم: "نامناسی؟ ئەو قسانە چییە؟" گوتی: "ئەوە لەبەرم کردووە، بۆ هەموو مشتەرییەکی لادێی دەیڵێم، بیناسم و نەیناسم". گوتم: "من هەژارم" دەستی کرد بە گریان. گوتم: "گریانی ناوێ، عیلاجێك بکە، نابێ بهێڵی کەس بزانێ کە من لێرەم". گوتی: "بەڵێ یەك نەفەر هەیە دەبێ بزانێ و ئەوە دەچم بانگی دەکەم".

ڕۆیشت، پاش تۆزێك هاتەوە، پیاوێکی عەینەك لەچاوی، پیری سمێڵ تاشروی درێژی، رانکوچۆغە پینەکراوی دەگەڵ خۆی هێنا. کابرا هەر لەدوورەوە گوتی: "ئای گووم کردە ئەو پشتێندە گرێچنە ئێرانیانەت؟ هەتیو، خۆ پۆلیس بتبینێ، دەتگرن". دانیشت بەبێ ئەوەی بلێ ماندوو نەبی، گوتی: "غەم مەخۆ ئێمەش زۆرجارمان خۆ ماندوو کردووە و چیمان پێ نەماوە. ڕۆژێك دەبێ هەر سەرکەوین. هەستە با بڕۆین". بردمیە ماڵە خۆی. هەر ئەوەندەی نیوسەعات نەچوو کەکارێکی وای کرد من شەرم نەکەم و ماڵە وی بەماڵە خۆم بزانم. ئەمرم دەکرد بەکچ و ژنی ئەو: "چام بدەنێ، ئاوم بۆ بێنن". ئەو شەخسە ناوی میرزا ڕەحمانی بانەیی بوو کە بەحەقیقەت لەدواییدا بوو بە ماموستای ڕۆحی و زۆر شتی فێرکردم و هەروەها پەناو پەسێوی هەژاران بوو، ئەگەر چی بۆ خۆشی هەژار و دەستتەنگ بوو. میرزا ڕەحمان چاکترین شەخسێکە کە من لە حەیاتما تووشی بوومە کە هەرگیز لەبیر ناچێتەوە. بەڵام داخی گرانم ئەمڕۆ کەوا کورد هێندێك باوی پەیدا بووە و هومێدیان هەیە، میرزا ڕەحمان لەخاکا نووستووە و گیاو گژ لەسەر گۆڕی شین بووە.

من لە ئاوریلی ساڵی 47دا چوومە بەغداو لەو ڕۆژەوە برسیایەتی و ڕووتی و نەداری و لەش بەباریم دەستی پێ کرد. زمانم نەدەزانی، هیچ کەسم نەدەناسی. لەخانێکی کۆنی ناخۆشدا دەژیام

کەباسی ناخۆشییەکەی بەکتێبێك تەواو نابێ، چونکە هەرزان بوو. منیش ئەگەر چوومە بەغدا شازدە دینارم پێ بوو. مانگی دوو دینار کرێی خەوم دەدا، باقیی دیکە پێی بەڕێوە دەچووم‌و هەر لەبەیانییەوە من بەرم لەدوکانان دەگرت تا ئێوارە هەر دەچووم دەمپرسی: "شوغڵ؟" (چی تریشم نەدەزانی)، سەریان لێ ڕادەوەشاندم.

ڕۆژێك کابرایەك بەکوردی لێی پرسم: "کوڕە تۆ چ کارەی؟" گوتم: "کوردم‌و غەریبم‌و زمان نازانم، کارم دەست ناکەوێ" گوتی: "کوردی سابڵاغیت؟" گوتم: "بەڵێ". گوتی: "منیش سابڵاغیم‌و جوولەکەم‌و ناوم یێرمیایە، من کارت بۆ پەیدا دەکەم". ویستی پووڵم داتێ، نەمویست، گوتم: "کار نەکەم پووڵی بە خۆڕاییم ناوێ". گوتی: "دەسا دەعوەتت دەکەم، نان بخۆ" قەبووڵم کردو جەمێکم خوارد، هێزێکم هاتەوە بەر، ئەمجا گوتی: "بچۆ لای منەشێ بڵێ کارت بداتێ".

گوتی: "بڵێ، یێرمیا دەڵێ کارت بداتێ" کە چووم پێم گوت، گوتی: "باشە، سەری مانگ وەرە کارێکت بۆ پەیدا دەکەم". هاتمەوە بەیێرمیام وت: "حەوت ڕۆژ ماوە بۆ سەری مانگ، لەو حەو ڕۆژەدا چی خۆم؟" گوتی: "بچۆ تەکیەی غەوسی گەیلانی، لەدیوەخانی نەقیب کابرایێکی لێیە ناوی حوسێن کەڕەناچییە، سابڵاغییە. بڵێ: "من یێرمیا ناردوومی بۆ لات، کارم بۆ پەیدا کە". چووم کا حوسێنم دیتەوە. پیاوێکی پیری کەچەڵی قسە خۆش لەسەر کورسییەك دانیشتبوو، قەلیاناوی دەکێشێ. منیش کەسیف‌و پیس‌و چڵکن چووم، گوتم: "یێرمیا ناردوومی". گوتی: "سابڵاغیت؟" گوتم: "بەڵێ" گوتی: "چاییێکی بۆ بێنن" هەر دانیشتم‌و هەر دانیشتم، کابرا چی نەگوت. پاشان گوتم: "مامە، ئەگەر کارم بۆ پەیدا ناکەی، پێم بڵێ". گوتی: "ڕۆڵە، کار پەیدا بووە، تۆش وەك من چم کرد بیکەو چم خوارد بیخۆو خەلاس".

لەو ڕۆژەوە مام حوسێن‌و ئامینەی ژنی کە هەرتك پیرو فەقیر بوون، بوونە باوك‌و دایکم لە غوربەت. ڕۆژانە لەگەڵ کاحوسێنا ئاوپرژێنی قەسری نەقیبمان دەکرد، دەمانماڵی‌و کاشیمان مەسح دەکردو نانمان دادەنا. پاش خەلاس بوونی هەموو کارێك خۆشمان نانمان دەخوارد. مانگی ڕەمەزان سەرانسەر ئەو کارەم کرد. کاحوسێن پێی گوتم: "سەری مانگ مەعاشت بۆ دەستێنم لە نەقیب" بەڵێ ڕۆژی جێژن نەقیب چوارییێکە دینارێك کە حەقی ڕۆژێکی کارگەرێکە بۆی ناردووم، منیش نەمویست، مام حوسێن گوتی: "کاری بۆ مەکە".

دیسان کەوتمەوە کار پەیدا کردن، پاش زەحمەت‌و گەڕانێکی زۆر لەڕەستۆرانێکی دامەزرام کە ئاو تێکەم‌و وەڵات گەسك دەم‌و کاشیی عەرزی ژوورەکان بە پەڕۆییێکی نمناك بماڵم، مانگی چوار دینار پوول‌و خواردنم بدەنێ‌و شەویش لەسەربانی ڕەستۆرانەکە بنووم. دەبێ ئەوە بزانرێ کە لەبەغدا هاوینان دەرەجەی گەرما لەبەینی چل‌وپێنج‌و چل‌و هەشت دەرەجەدایە، منیش لەو دەمەدا لەو ڕەستۆرانە بووم. سەعات پێنجی بەیانی هەڵدەستام لەخەو، گەسکم هەڵدەگرت‌و دەمماڵی‌و لەپاشان بەکوتە تەلیسی تەڕ کاشیم دەماڵین. ئەوجار مێزو سەندەڵیم ڕێك دەخستن کە پتر لە چل مێز بوون‌و هەرییێکە چوار کورسی بوو. ئەوانەشم هەمووی بەپەڕوی خاوێن دەتەکاندو دەمماڵین.

ئینجا لەسەعاتی هەشتەوە مشتەری پەیدا دەبووم بۆ بەرچیی خواردن. دەبوو من ئاویان بۆ بەرم‌و دوای خواردن قاپە بەتاڵەکان هەڵگرمەوەو بیبە بۆ قاپشۆر. مەخسووسەن لەسەعاتی یازدە تا دووی پاشنیوەڕو کە وەختی نانی نیوەڕۆیە بوو، نە من وە نەگارسۆن یێك دەقیقەش نەماندەتوانی بەڕۆیشتن بڕۆین. وەك بارگینی عەجەمان هەموومان یۆرغە ببووین. هەمووی بەری پێم کاوە کاوی بوو، لەسەعات دوو تا دووو نیو خەڵك دەهاتن. دەیانگوت: "ئیستراحەت بکەن" حەتتا لە ئاوەدەستیش نەیاندەهێشت ئاو بەخۆدا کەین، کە ئاو هیچ قیمەتی نییە لە بەغدا. ئەوجار بەو گەرمایە نەیاندەهێشت لەبەر سێبەر دانیشین، چ جای بنووین. دەیانگوت: "مەبادا مشتەری بێن‌و بتانبینن مەنزەرەتان پیسە" بەو گەرمایە ەچووم لە سەربان رادەکشام کە لاقم تۆزێك بحەسێتەوە. بەڵام لە ئارەقدا شەتڵ دەبووم. لە سێ‌و نیوەوە دەبوو من ئەو هەموو مێزو سەندەڵییانە بێرمە سەربان، سەبانیش بماڵم. ئەمجار هەموو شتێك ڕێك بخەم بۆ گارسۆنان. ئاوپرژێنی حەوش‌و سەربان دەبوو بکەم.

ئەمجار دیسان مشتەری دادەبارین، ئاو تێکەم‌و قاپی بەتاڵ هەڵگرمەوەو بێم لەسەر خەیابان جگەرەیان بۆ بکڕم، سەرباری هەموویش بێگاری خاوەن ڕەستۆران‌و گارسۆنان کە منیان لەجیاتی کڵفەت‌و نۆکەر دەکار دێناو کاری ماڵە خۆیان پێ دەکردم. ئەوە دەبوو هەڵێم‌و هەڵسووڕێم تا سەعاتی دوازدەی نیوەشەو. ئەمجار ڕەستۆران چۆڵ دەبوو. دەبوو مێزو کورسیان هەموو بێنمەوە خوارێ‌و سەربان گەسك دەمەوە، پرزەو زیل‌و زاڵی ئارەقخۆران بخەمە ناو سندووقی زبڵەوە. ئەمجار باغچەی حەوشی ڕەستۆران ئاودەم. لەسەعات دوو دەیانگوت "بڕۆ بنوو". دەهاتم بە سەربان حەسیرە شڕێکم رادەخست‌و جلەکانی خۆم دەکردە سەرین. ئەو دوو سەعاتە رادەکشام. لەسەعات پێنج دیسان هەمان پەت‌و هەمان سینگ. کارەکەم دەستی پێ دەکردەوە. لەسەعات حەوت‌و نیوی بەیانی دەیانگوت: "وەرن نان بخۆن‌و". من‌و قاپشۆرو شاگرد کەبابچی کە ئەوە ئێمە تەبەقەی لە هەمووان پەستر بووین، دەچووین. یێکی حەبێکیان لە "روحی شەکر" بۆ دەخستینە ناو کوپێك چاوەو یێکی سەموونێکی ڕەقهەڵاتووی دوێنێ کە ئیتر تازە کەس نەیدەخوارد دەبوو فڕێ بدرێ دەیاندایێ.

لەبیرمە ڕۆژێك کە سەموونە ڕەکەم بۆ بەتەنیا نەدەخورا، دەستم برد دەسکێکم کەرەوز هەڵگرت (کە سێ دەسکی بە فلووسێکە) کە

بیخەمە ناو سەموونەکەم. کابرای ساحێب ڕەستۆران چاوی لێ بوو، هات، لەدەستی ساندمەوەو سێ– چوار جنێوی قەڵەوی تەحویل دام. ڕۆژێك بانگیان کردین کە وەرن کەباب بخۆن. بۆ ئێمە زۆر شتێکی عەجایب بوو. باوەڕمان نەدەکرد، بەڵام کە چووین دیتمان گۆشتیان لێ بۆگەنیو ببوو، بەجۆرێك لەبەر بۆگەنی نەتدەتوانی لێی نێزیك ببیەوە. هەر وەك سەگێك تۆپیبێ و با بۆنەکەت ب بێنێ. هەر هەلاتین گوتمان: "بابە، حاشا لەو کەبابەی کە پێی دەمرین، سەموونی خۆمان دەنێ و بەس" دیسان چەند جنێوێکمان پێ گەیشت، گوتیان: "ئێوە فێری فەقیری و شت نەخواردن بوون، گۆشت ناخۆن، سەموونتان دەوێ، ئاخۆ بۆیە خودا ناتانداتێ". نیوەڕۆیان و شەوانە پاش خەلاس بوونی مشتەری هەر یێکە لە دەورییەکدا وەك چێشتی مجەور تێکەڵ: برینجی ڕەقی بن مەنجەڵ، وردە گۆشت و ئێسك، باینجانی سووتاو و بیبار، خولاسە لەو هەموو مەنجەڵانە هەرچی مابۆوە، بۆیان لێك دەداین و یێکی سەموونێکیان دەداینێ و حەقمان هەبوو بەفراوی لەسەر بخۆینەوە. ئێستا بۆیە یێك دیوانم لەدیوانی خۆم نێو ناوە "چێشتی مجەور"، تا هەموو جارێ ئەوەم وەبیر بێنێتەوە.

دوو مانگم بەو جۆرە ڕابوارد. سەری مانگی هەوەڵ هەر تەفرەیان داین و مواجیەکەیان نەداینێ تا سەری مانگی دووەم. ئەوجار گوتیان: بەخوا نابووت بووین و پووڵتان نادەینێ". هەرچی داد و هاوارمان کرد، بێ فایدە بوو. قاپشۆرەکە وو شکایەتی کرد. دوو پۆلیس هاتن. دەس بەجێ خاوەن ڕەستۆران داینان و یێکی چارەکێك ئارەقی بۆ هێنان و خواردنی دانێ. بەخوا پۆلیسم پۆلس بێ وەرگەڕانە گیانی قاپشۆرەکە بە شەق و زللە بردیان بۆ حەپس. ئیتر ئێمە نەمانوێرا فززەی بکەین. حەسیرە شڕەکەم پێچاوە و لەسەر شان بردمەوە لای تەکیەی غەوسی،ماڵی مام حوسێن. ئەمجار پاش چەند ڕۆژێك مام حوسێن دایمەزراندم لای سەید برایمی نەقیب، کە ئەویش ئامۆزای سەید نەقیبی غەوسە. مانگی چوار دینار و خواردنم بدەنێ و شەوانەش لە تەکێی غەوس بنووم.

ئەو سەید برایمە 540 خانووی بەئیجارە دەدا کەموڵکی خۆی بوو. باغێکی هەبوو خورما و پرتەقاڵ. ئەوساڵی من لەلای بووم، بە 7400 دینار بەئیجارە چووبوو. دەیانگوت پێنج ملیۆن دیناری لەبانکدا هەیە. ئۆتۆمبێل و قەسری توو ئەندەر تووی و قەسری کوڕی هەر باسی ناکرێ کە چۆن بوو. بۆ خۆی ژنی نەمابوو. نۆکەریش من و شۆفێرێك و سۆفییەکی ئەفغانی و کوڕێکی هیندی و کلفەتێکی جوانکەلەی حیزو دوو پیرێژنی لەلا بوون. کاری من ئەوەبوو لەگەڵ کلفەتەکە وەتاغی دانیشتن و نووستنی سەید برایم ڕێك خەین و وەختی نان خواردن دەبوو من نانی بۆ بەرم و لەبەرچاوی خۆی ماستاوی بۆ بکەم. چونکە من ئیختساسی بووم لە ماستاو دروست کردندا. هەموو چێشتەنگاوێك لەگەڵی سواری ترومبێل دەبووم دەچووینە باغەکەی تا سەعاتێك دوای نیوەڕۆ.

زۆر سەیر بوو ئەو باغەی گوتم بەئیجارەی دابوو، هەموو ڕۆژێ دوو سێ قەرتاڵی خورما دەهێناوە، بەڵام نەیدەهێشت ئەمن نەشۆفێر دەنکێك خورما بخۆین. کابرای باغەوان بە دزییەوە پێی گوتین: "هەموو ڕۆژێ دەسرەی خۆتان بدەن بەمن، خورماتان بۆ تێ دەکەم. چوون ئەو سەید برایمە ئەوەندە پیس و چرووکە، هەرچەند باغ لە ئیجارەی مندایە و ئەو هیچ زەرەر ناکا دیسان پێی ناخۆشە منیش بیبەخشم". ئەو دەوڵەمەندە ڕۆژانی جومعە سەد فلووس، فلووس فلووسی لەناو کیسەیەك دەکرد و بە فەقیرانەوە دەگەڕا، یەکی فلووسێك یا دوو فلووسی دەدانێ. بەوەباسیان دەکرد کە زۆر سەخییە. کەچی ئەگەر هیندی و پاکستانی دەهاتنە لای، چوار شاییشی لێ وەردەگرتن. نەیدەهێشت لە وەختی بێکاریشمدا ڕۆژنامە بخوێنمەوە. دوژمنی خوێندەواری بوو. ڕۆژێك گوتم: "ئەفەندی، چ زیانی هەیە بۆ تۆ کە من ڕۆژنامە بخوێنمەوە؟" گوتی: "من نامەوێ عیلمی شەیتانی فێر بی".



گەلێك ڕۆژان منداڵی کوڕەکەی دەهاتن، دەبوو من ببمە لەلەی منداڵان و بیانگێڕم و ئاگام لێین بێ و ئەگەر ماندوو بوون بەباوەش هەڵیان گرم. بەڵێ نیسبەت بەرەستۆرانەکە حاڵم زۆر خۆش بوو. بەڵام قەدەرێك نەخۆش کەوت، بەحەیاتم ترسەنۆکی وام نەدیوە. بەو سەرو سیما و ڕیش و پەشمەوە ڕۆژێ هەر دەگریا، دەیگوت: "دەمرم". هەر جارێك کە بچووبا ئاودەست، دەبوو من و نوورییە – کچە جوانەکەی کلفەت– بەتەختەوە هەڵیگرین و لەبەر ئاوەدەست داینێین. هەر لەئاودەست هاتبا دەر خۆی لەسەر تەختەکە ڕادەکشا و دەمانهێناوە جێگاکەی خۆی لەناو باغچەی قەسر.

شەوێك درەنگ کە دەگەڵی دەچوومەوەماڵێ، لەپێشەوە دەڕۆیشتم، چونکە لەتاریکی دەترسا. لەپلەکان سەرکەوتین، دووپشکێکم دیت و پێلاقەم پێدا داو کوشتم، گوتی: "ئەوە چ بوو؟" گوتم: "دووپشك". ئیتر ببڕای ببڕای بوێرێ لەو پلیکانانە سەرکەوێ ئەبەدەن. ڕێگاکەی گۆڕی. بە ڕیزە پلیکانێکی دیکەدا دەچوو. جا هەر بەمنی دەگوت: "بەخوا ڕاستە کورد لە هەموو میللەتیکی ئازاترن"، سەد جاری لە مەجلیسان گێڕاوە کە ئەو نۆکەرە کوردەی من بەپێلەقە دووپشکێکی کوشت...

بەڵام لەئاخرو ئۆخری مانگی سێهەمدا بوو خواردنمان زۆر کەم دەدرایە تێرم نەدەخوارد. ڕۆژێك بەمام حوسێنم گوت. بەڵام سەید برایم گوتی: "هەر ئەوەیە، زیادی ناکەم". لەلای ڕۆیشتم. مواجیبی مانگ و نیوێکم لەلای بوو. کەزانیی ڕۆیشتووم، پارەکەی نەدامێ و گوتی: "دەیدەمە پۆلیس، عەسکەریی نەکردووە". بەخوا گوێم نەدایە. تۆزێك فێری عەرەبی ببووم. پتر لە خۆم رادەدی کار پەیدا بکەم.

ئەمجار چوومە لای وەکیلێکی دادگوستەری ناوی عەبوود شاڵچی بوو. مانگێ بەحەوت دینارو نیو، نانی نیوەڕۆشی بۆ بێنم و بۆ خۆشم بخۆم. ئیدارەکەی چوار وەتاغ بوو، ڕۆژێ خاوێنم دەکردەوە و نیوەڕۆیان دەیناردم بۆ ماڵە خۆیان نانی بۆبێنم. ماڵەکەین بەدوو مەرحەلەی ئۆتۆبووس دەچووم. پاشان بیست دەقیقە بەپێ دەگەیشتمێ. ئەویش چل فلووسی دەدامێ، حەقی ڕێگە. چل دەقیقەش بەپێ ئەوسەرو ئەوسەر، بەو حاڵە نانم بۆدێنا. لەو دەمەدا مانگی کانوونی سانیی چل و هەشت بەسەردا هات کە میللەت قیامی کرد بۆ زیددی پەیمانی پۆرتیسمووت و بوو بە مێتینگ و موزاهەرات، من ڕۆژانە پاش خاوێن کردنەوەی وەتاغەکان بەپەلە دەچووم رەگەڵ مێتینگ دەکەوتم. ناکرێ باسی ئەو قیامەتە تاریخیەت ئێستا بۆ بکەم، بەڵام دەزانی کەزۆر گەنج بەکوشت چوون و پەیمانێکی لە ئینگلستان بە مەرەکەب نووسرا، خەڵکی عێراق بەخوێن کوژاندیانەوە و پەیمانیان پێ هەڵوەشاند.

ڕۆژێك لە ڕۆژان کە پۆلیس تەقەیان لێ کردین، کابراییێك لەتەنیشت منەوە بوو، تفەنگێکیان لەسەر دڵیدا. کەوت. من غارم دا هەڵیگرم و بیبەمە پەسکووچەییێکەوە. کە من لەسەری داهتمەوە لەپڕ بە هەموو هێزێکییەوە قۆناغە تفەنگێکیان لە مورەغەی پشتم دا، کەوتم، کە دەستیان دا پیلم بمبەن، لەو دەمەدا دیسان جوانەکان دەستیان کردەوە بەخشت و بەرد باران لە پۆلیسەکان. پۆلیس هەڵاتن و منیان بەجێ هێشت و کەلاکی کابراش بەجێما. بەلارە لارەوە چوومە ماڵی کاك حوسێن. لەوێ کەوتم. پاش دوو ڕۆژ چوومە لای ئاغاکەم. گوتم: "نەخۆش بووم، بۆیە نەهاتووم" ئەگەر هەزار جنێوی پێ دابم، کەمە. گوتی: "پێم وایە تۆ هەموو ڕۆژ دەچییە مێتینگ دان" بەهەزار سوێند گوتم شتی وا نییە. دوای چوار ڕۆژێك دیتم عەبدێکی رەشی راگرتووە و منی دەرکرد. گوتم کەڕۆژنە دەچووم نانم بۆ دێنا، بەڵام ڕۆژانی جومعە دەیگوت: "بڕۆ مەیەوە تا ئێوارە". کوڕێکی دیکە هەبوو، فەڕاش بوو لە مەحکەمە تورکمەن بوو. ئەو ڕۆژی جومعە دەهات و من دەڕۆیشتم. ڕۆژێك پرسیم: گوتم: "بۆچی ڕۆژی جومعە دەڵێ مەیەوە تۆ دێی؟" گوتی: هەرچەندە ئەو وەکیلە ژنی جوانیشی هەیە، بەڵام ڕۆژی جومعە قەحبە دێنێتە ئیدارەکەی تا ئێوارە، من خزمەتیان دەکەم و دەزانێ کە تۆ وکردی و شتی وا قەبووڵ ناکەی، دەزانێ کورد هێشت بۆنی مەدەنییەتیان بەلووتی نەگەییوە".

دیسان بێکار مامەوە، لەو بەینەدا رەفیقی باش و خۆشەویستم پەیدا کردبوون. رەفیقێکم کە ناوی مەحموود ئەحمەد بوو، ڕۆژێك پێی گوتم: "ئەگەر بچی شاری کووت، لەوێ دەتکەن بەعەمەلە و بەسەر فەعلەی قوڕکاری رادەگەی، ڕۆژی بەچوارسەد فلووس و جێگەی نووستنیشت دەدەنێ". گوتم: "دەچم، مانگێ نۆزدە دینار زۆرە بۆمن". کاغەزێکی دامێ بۆ موهەندیسێکی کورد لە کووت. لەوێ دامەزرام و ناردمیانە شارێك کەناوی نەعمانییەیە، ئەو شارە ئاساری نەعمانی بنی مەنزەری کە بارامی گۆڕی بەخێو کردووە، لێیە. ئیدارەی پۆلیسی ئەوێمان تەعمیر دەکردەوە. شەوێ لەیەکێك لە وەتاغە چۆڵەکاندا دەنووستم. زستان بوو. زۆر سەرمام دەبوو. مزگەوتێکی سوننیانی لێ بوو، مەلای مزگەوتەکە گوتی: "وەرە لەحوجرەییێکی مزگەوت بنوو" شەوانە بەرەی مزگەوتەکەم بەخۆمدا دەداو چای گەرمم دەخواردەوە، ئیتر لەدەست سەرما خۆم دزییەوە.

دەبوو لەسەعاتی پێنجی بەیانییەوە بچمە سەر کار.

فەعلی عەرەبمان هەبوون. ئەو فەقیرانە بە پێخاوسی و بەکراسێکی تەنکی درێژ لەو سەرمای بەیانەوە تا دوازدەی نیوەڕۆ یەك وچان کاریان دەکرد. لەسەعات دوازدە تا دوازدە و نیو وچانی نان خواردنیان بوو. دەنکێکی رەش لەناو برینجدا هەیە، پێی دەڵێن "داڕوجان" کە لە کوردستان فڕێی دەدەن، چونکە هێندە تاڵە، مریشکیش نایخۆن. لەوێ ئەوە لە دووکاندا دەفرۆشرا، فەعلەکان ئاردی ئەو داڕووجانەیان بە ئاو دەگرتەوە وەك سەولەی سەگان، دەیانهاوێشتە سەر تەنەکییێکی رەش، هەروا تۆزێك خۆی دەگرت، دەیانخوارد. لەدوازدە و نیوەوە تا پێنج و نیو دیسان کاریان دەکرد. هەموو ڕۆژێ بەسەدو پەنجا فلووس، دەسووڕەتێکدا کە ئەوان فەعلەی حکومەت بوون و قانونیش دەیگوت: "دەبێ فەعلە هەشت سەعات کار بکاو هیچ نەبێ، دەبێ دووسەد فلووس وەرگرێ". ئەمجار بەو حاڵەش موهەندیس و سەر عەمەلە بەرتیلیان لێ دەستاندن کەکاریان پێ بکەن.

ڕۆژێك بەفەعلەییێکی جحێڵم کە خیزی بۆ ئەوانی دیکە تێ دەکرد، گوت: هۆو کابرا پیرە ماندوو دەبێ، زۆری بۆ تێ مەکە". ئێوارە هەموویان لێیان پرسیم: "تۆ لەکوێڕا هاتوویی؟ چ میللەتێکی؟" کوڕە بۆچی دەپرسی؟ گوتیان: "چونکە ئەوە جارێك لەژیانماندا ببینین سەر عەمەلەییێك جنێومان پێ نەداو دەشڵێ روحم بەپیر بکەن". ئەگەر یەکێك چڵێکی کاهووی چوار فلووسیی بخواردبایەو گەڵا پیسەکانی فڕێ بدایە، فەعلەکان گوێپچڕێنەیان لەسەر دەکرد. شەوێك من و وەستای بەننا و نەجاڕ بەچراوە چووین، شەوارەمان کرد، حەوت کۆترمان لە تەویلە کۆنێکدا گرت. فەعلەییێك پاڕاوە، گوتی: "بۆتان خاوێن دەکەمەوە، سەروپێ و جەرگ و ڕیخۆڵەی ئەو کۆترانەم دەنێ".

ئەو شەوە زۆر سارد بوو. باران دەباری. نیوە شەو کە هەستام لە خەو، چوومە دەر، دەبینم وا چەپڵە ڕێزانەو گۆرانی گوتنە لە ژووی فەعلەکان. چوومە پشت پەنجەرە، گوێم هەڵخست. بە قامیشە ڕزیو ئاگریان کردۆتەوەو تەنەکیان لەسەر دانابوو. ڕیخۆڵەو سەروپێی کۆتریان دەبرژاندو چەپڵەڕێزان و گۆرانییان بۆ ئەو جێژنە بوو. ئیتر سەرماو سۆڵ و هەڵلەرزینەکەیان لەبیر چووبوّوە. گوێم لێ بوو، یێکیان گوتی: "چی دی قامیش مەسووتێنن، سبەی دەرمان دەکەن" یێکیان جوابی داوە، گوتی: "ئا، ئەو عەزیزە (ناوم عەزیز بوو لەوێ)، کوڕێکی باشە، بۆمان دەپۆشێ، سبەی زوو ڕاستی پێ دەڵێین"

ڕۆژێك گوتیان: "ئەوڕۆ سەرعەمەلەی دیکە لێرە نین. تۆ ئەگەر دوو سەعات ئیجازەمان بدەی، ئێمە بۆ خۆمان بەزم و ئاهەنگ دەگرین و کەیف دەکەین". ئیجازەم دان. پێم وابوو بۆ خۆیان چێشتی برینج لێ دەنێن. پاش تاوێك کە هاتمەوە لایان، دیتم ئەوا خورمای زوهدی کە لەبەر خراپییان کیلۆی بەهەشت فلووس بوو، لەپێش خۆیان هەڵرشتبوو، دەیانخوارد. گوتم: "ئەوە ئاهەنگەکەتان خورما بوو؟" گوتیان: "بۆ ئەوەت پێ کەمە؟" یەکێکیان سوێندی خوارد گوتی: "لەسەر ئەم هەموو هەرزانییەش دوو ساڵە تێرم خورم نەخواردووە. سەدو پەنجا فلووس چی بۆ نان و ئاوی عایلەو خۆم خەرج بکەم و چییان بۆ بدەم بەبەرگ؟ لەساڵیشدا پتر لەدوو مانگ کارم دەست ناکەوێ".

حیکایەتی وام بەهەزاران لەلایە کە خۆم دیومە ناتوانم بۆت بگێڕمەوە. بەڵام من هەموو ڕۆژو هەموو شەو بۆ حاڵی ئەو بێچارانەو هەزارانی دی لەفەللاح و فەقیران چەند جار دەگریام، دەمگوت ئاگرم تێ بەربوو. گوتم: "ناژیم لێرە ئەو حاڵەی ببینم، دەچمە بەغدا" هەرچەند هەوڵیان لەگەڵم دا، موهەندیس گوتی: "مەڕۆ، تۆ ئەمینی و لێم نادزی، ڕۆژی مەعاشت بۆ دەکەمە شەشسەد فلووس". نەمتوانی چوام لەو حاڵە پەرێشانە بێ. سیپالم پێچاوەو هاتمەوە بەغدا.

نێزیکەی مانگێك کارم دەست نەکەوت. ئەو پووڵەی لە نەعمانییە پاشکەوتم کردبوو، هەمووم چوو. کەوتمەوە موحتاجی و برسێتی. لەپاشا ڕۆژێك هاوەڵێکم دیت، گوتی: "تۆ عەرەبی دەزانی، من دەستمایەی دوکانێکت دەدەمێ، پێکەوە شەریك دەبین". ئەوە سەرەبەهاری ساڵی چل و هەشت بوو، دووکانێکی کتێبفرۆشی و وردەواڵەمان دانا لە بەغدا. ناومان نا "مەخزەنولشوهەدا"، بەنوی شەهیدەکانی قیامی میللەت. دووکان قازانجی نەکرد، بەڵام نانی ئێمە لێ پەیدا دەبوو. دوایی ڕەفقەکەم گوتی: "من دەیفرۆشم". لە مایەکەی شەش دینارمان زەرەر کرد. دیسان دەست لە گونان درێژتر بەرەڵا بوومەوە. ئەمجار پاش چەندێك جوولەکەکەی هاوەڵم گوتی: "تۆ سەرڕشتەی دوکانداریت پەیدا کردووە، ئەگەر موحەسیلینی کورد دەناسی، ئەوانە پووڵیان بۆ دێ، بیست دینارو سی دینار لەسەر یەك بۆ مخاریجی چەند مانگێك، لێیان وەرگرە، دوکانێکی دانێ. ئەوان وردە وردەیان دەوێتەوە". بەو حیلەیە سەد دینارم لە هەشت نەفەر موحەسیل. ئەمجار جوولەکەکە دەڵاڵی بازاڕ بوو، کردمیە ئاشنای دوکانداران و بۆم بوو بەزامن کەشتم بدەنێ و ئەگەر فرۆشرا بیاندەمەوە. دووکانێکم دانا، دیسان هەر بەناوی "مەخزەنولشوهەدا". هەم وردەواڵەم دەفرۆشت و هەم کتێب.

حێزبێکی فاشیست هەبوو، کە حیزبی ئیستقلالیان پێ دەگوت. شەوێك ئەفرادی ئەو حیزبە هجوومیان کردە سەرم، شوشەیان شکاندم، کتێبەکانی دەستی چەپیان هەموو دڕندو مەخسووسەن ئەوی بە قەڵەمی عەزیز شەریف و عەبدولرەحمان شەریف بوو. هەڕەشەیان لێ کردم کە دەبێ ناوی مەخزەنەکەم بگۆڕم. بەڵێ، ناوم نا "مەخزەن موختار"و تەرکی کتێبفرۆشیم کرد. بەڵام دووکانکەم زۆر باش بوو. ئەگەر باشیش بوو بۆ خۆم هیچ ئیستراحەتم نەبوو. هەر لە سەعات پێنجی بەیانی تا سەعات دوازدەی شەو بەتەنێ لەوێدا بەپێوە رادەوەستام. خواردنیشم ئەو چەند ساڵە هەر سەموون و شەربەتی پیس بوو. هێند زەعیف و لاواز ببووم، کەتووشی نەخۆشی سیل هاتم. حەوت ڕۆژان لە نەخۆشخانەی بەغدا نووستم. لەپاشان دەریان کردم گوتیان: "جێگەی نەخۆشی سیلمان نییە". دووکانەکەم فرۆشت قەرزی خەڵکم دایەوە. نێزیکەی هەشتا دینارم بۆ ماوە.

تا ئەو دەمە ڕەفیقی زۆر باشم پەیدا کردبوون. بۆم کەوتنە هەوڵدان پەساپۆرتێکیان بۆ دروست کردم و لەو دەمەدا عەلی حەیدەر سولەیمان کەکوردێکە، وەزیری لەشساغی عێراق بوو، برادەریان ناردە لای، واسیتەیان کرد کەعەلی حەیدەر لەسەر حیسابی حکوومەت ناردمە جەبەل لوبنان لە مەسەح حەننەس (سەناتۆریی بەحەننەس) نواندیانم. تەبیعییە بەناوی عەزیز قادو کەسیش لە حکوومەتەوە نەیدەزانی من کێم. تەنها هەر ئەوەندە کەمن نەخۆشێکی عێراقیم. دووساڵ دەڕۆژ کەم، یانی لە 23ی نۆڤامبری چل و هەشت چوومە سەناتۆری و لە 13ی نۆڤامبری ساڵی پەنجا دەرکەوتم. وەزنم بیست کیلۆی زیاد کردبوو.

ئەو دووساڵەیەکیین لەسەر تەختێك نووستبووم، نەدەجووڵامەوە مەگەر وەختی نان خواردن یان میز کردن. لەبەر ئەوە زگم زل ببوو، هەم لەو هەموو نووستنە وا تەنبەڵ ببووم، کەهێزی بەرێدا ڕۆیشتنم نەبوو. دەردو داخێکی کە من لەو سەناتۆرییە دیتوومە بەتەنێ کتێبێکی دەوێ. بەڵێ هەرچەندە، لەسەر حیسابی دەوڵەت بوو، بەڵام لەگەڵ چینی هەرە فەقیر لەدەرجە سێ بووم. خواردنمان سەگ بیخواردایە پشیلە دەڕشاوە. ئەوجار بۆڵەو جنێوی ڕاهیبانی مەسیحی و بەرتیل ئەستاندنی خزمەتکاران و مەحکوومیەتی زۆرو بێمەعنا ئەو دوو ساڵە زۆرم عەزابی روحی پێ گەیشت، بەڵام لەعەینی وەختیشدا ژیانم زۆر پان و پۆڕو بە تەجروبە بوو. کتێبخانەیەکی لێ بوو، پتر لە دوو هەزار جڵدی کتێبی باشی ئەدەبی و تاریخی و ئیجتماعی و سیاسیی تێدا هەبوو، کە هەر نەخۆشان بۆ خۆیان چەند ساڵ بوو کۆیان کردبووەوەو هەمیشە پیاوی باشیان هەڵدەبژارد بۆ مدیری کتێبخانە.

ئەو کتێبخانە موڵکی نەخۆشخانە بوو، نەهی سەناتۆری. هەر نەخۆشەی مانگی بیست و پێنج فلووسی دەدا هەقی خوێندنەوە. ئەو پووڵە دەدرا بەکتێب و هەر نەخۆشێك کە بۆ خۆی کتێبی دەکڕی، پاش

خوێندنەوە دەیکردە دیاری بۆ کتێبخانە. شەوو ڕۆژ دەمخوێندەوە. ئەوجار پیاوی زۆر زانا و خوێندەوار لەوێ نەخۆش بوون، هێندێک ئینگلیسی فێر ببووم. بەڕاستی بۆ من ئەو فرسەتە مەدرەسەییێکی گەورە بوو، کە زۆر چاوم کرایەوە. کاتێ دەرکەوتم لەمەسەح (سەناتۆری) زۆر داماوو پەرێشان بووم.

حیکایەتێکی ڤیکتۆر هیگۆ هەیە، ناوی "بێچاران"ە. بە عەرەبی بەناوی "ئەلبوئەساء" تەرجومە کراوە، لەوێدا کابراییێک ناوی جان ڤالحانە لەپاش ئەوە کە نۆزدە ساڵ لەسەر کولێرەییێک حەبس کراوە، ئازاد بووە، دێتە دێیەک، کەس ڕایناگرێ. مەجبوو دەبێ شەوێ لەبەر باران و لەناو قوڕ دەخەوێ، جا لە خۆیەوە دەڵێ: "نازانم، ئەوە چ حوڕییەت و ئازادییەکە دراوە بەمن؟ جاران لە حەبسدا بەس نەبوو نانم هەبوو، شەویش لەسەر تەختێک دەنووستم و سەریشم سەربان بوو و بارانم وێ نەدەکەوت..." منیش وام بەسەر هاتبوو. دەمگوت: "خوایە، من جاران بە ساخی و بە چوست و چالاکی زۆرم کار دەکرد و ماندوو دەبووم و کەمم دەست دەکەوت بیخۆم، ئێستا بەنەخۆشی و تەنبەی، دوکتر پێم دەڵێ: "دەبێ کەم کار بکەی و دەبێ شتی باشیش بخۆی" ئایا بە نەخۆشی لە مەسەح مابامەوە چاکتر نەبوو لەو لەشساغییە ناتەواوە؟ ئێستا چۆن کار پەید کەم و چۆن ئیتیراحەت بکەم؟).

هاتمە شام، پوولێکم هەبوو، 265لیرەی سووری لەلای کابراییێکی دۆست دامنابوو. چەند جارێک لەلوبنانەوە کاغەزم بۆ نووسی کە بۆم بێنێ، نەهات. پێم وابوو کاغەزی پێ نەگەیشتووە. گوتم ئەو پووڵە دەسێنمەوە و پێ دەچمە بەغدا. کە داوام لێ کرد، هەیهوو: "گەزی چی و جاوی چی؟ نیمە کە نیمە و لەلام نییە" "هەی دایکت چاک و بابت چاک، ئینسافت بێ، خۆمن بەپێ ناگەمەوە بەغدا.." "نەخێر مریشک هەر لاقێکی هەیە". هاوارم بردە بەر چەند دۆستێکم لەشام. چوونە سەری، بەهەزار ناری عەلی سەد و شێست لیرەیان بۆ لێ ستاندم و سەد و پێنجی خوارد.

گەییمەوە بەغدا، سی و پێنج لیرە کە دەبووە سێ دینار و نیو لەباغەڵمدا بوو. ئەویشم دا بە لێفەییێک و سەرینێک چوومەوە ماڵی مام حوسێنی خۆم. "بەخێرهاتی پەریزادە!" بەخوا هەشت نۆ ڕۆژێک مام، وردە وردە مەشقی ڕۆیشتنم دەکرد تا لاقم فێربێتەوە. ڕۆژێک مام حوسێن گوتی: "برایم ناوێک هەیە عەکاسە، گوتوویە بێ من کاری بۆ پەیدا دەکەم" چووم گوتی: "شێست دینارت دەدەمێ، قازانج بەنیوەیی، چاکەتە کۆنی ئامریکی بکڕە و بیفرۆشەوە". تاجری ئەوانەش جوولەکەیەکی سابڵاخی بوو، پێی گوتم: "ئەگەر بزانم خێرت بۆ دەکا، من خۆم دەتدەمێ و تا نەیفرۆشی، پوولم ناوێ و قازانجیش بۆخۆت، بەڵام ئەتۆ کە نەخەیاتی و نە ئوتوکێشی، زەرەر دەکەی".

شێست دینارەکەم هێناوە بۆ کابرا. ئەمجار چەند ڕۆژێک لەگەڵ کوڕێکی کورد لە قاوەخانەییێک کارم دەکرد، گۆیا شەریک بین، ئەویش چی لێ پەیدا نەبوو. دیسان ئەو برایمی عەکاس گوتی: "وەرە فێری عەکاسی فەوریت دەکەم بۆ خۆت بچۆ لەسەر خەیابانان و کووچان کار بکە" چەند ڕۆژێ هەوڵی لەگەڵ دام و فێربووم و دەگاییێکی کۆنی پیسی بۆ کڕیم و کەوتمە سەر خیابانان. چیت بۆ بڵێم؟ ڕۆژێ تا ئێوارە پتر لەسەد منداڵی ڕەش و ڕوتم بەدواوە بوو، کاروباریان نەبوو، سەیری منیان دەکرد. لە قاوەخانە نەیاندەهێشت دانیشم، چونکە منداڵ عاجزیان دەکردن، زۆر کەس عەکسی پێ دەگرتم، پوولی نەدەدامێ، دەبوو شەڕ بکەم. شەڕیشم نەدەکرد.

ڕۆژی باران کارم نەبوو. ڕۆژی دیکەش هەر لەبەیانییەوە وەک کیربڕی منداڵان ئەو دەزگایەم لەسەرشان بەناو قوڕو چڵپاوی زستانی کۆڵانی بەغدادا دەگەڕام، دەتکوت شانم هاتە خوار، لاقم سست دەبوون. تا تاوپەڕێ ئەگەر سەد و پەنجا فلووس، سان سەد و بیست فلووسم پەیدا کردبایە، زۆر بوو کە ئەوەش بەشی نانی وشک و هەقی جێگەی نووستنی نەدەکرد. (ئەو دەمە لە ماڵێی مام حوسێن نەمابووم). زۆری لێ وەرز بوون، ڕۆژێک دەزگاکەم هێناوە، دامەوە بەبرایم، گوتم: "ئەوە ناکەم". گوتی: "چی دەکەی؟" گوتم:

"من هەر فێری گەسک لێدان و کاشی ماڵین و خاوێنکردنەوەی دیوارو شوشوم، تۆش یەکی وات دەوێ، بەمنی بکە، چی دەمدەیەی بەزیاد بێ". قەرارمان کرد کە مانگی چوار دینارم بداتێ. چوومەوە سەر پەت و سینگی زەمانی پێشووم، گەسکی دەورێکی خە.

*          *          *

ئەم ژیاننامەیەی ڕەوانشاد مامۆستا هەژار لە کتێبی (ک. ر. ئەییوبی و ئی. ئا. سیمرنۆڤا: دیالێکتی کوردیی موکری. لێنینگراد 1968، ل142–185)دا بڵاوکراوەتەوە. تێکستەکە لەوێدا بەجۆرە ئەلفوبێیەکی لاتینی نووسراوە کە زۆر تایبەتییەو هەوڵ دراوە دابەشبوونی گراماتیکی و فۆنەتیکیی تێکسستەکە ڕوون بکاتەوە. دیارە کە هەژار لە بنەڕەتدا تێکستەکەی بەئەلفوبێی کوردی نووسیوە و دوایە بەنوسەرەکان. بۆ ئەوەی ئەرکی سەرلەنوێ هێنانەوە سەر ڕێنووسی کوردیم تووش نەبێتەوە، کاتی خۆی داوام لە مامۆستا ئەییوبی و مامۆستا هەژاریش کرد کە ڕوونووسێکی ئەو نووسینەم بۆ بدۆزنەوە و پەیدا بکەن، بەڵام بەداخەوە، دەستیان نەکەوت و لایان نەبوو.

لە کاتی نوسینەوەدا بۆم دەرکەوت کە لە گواستنەوەی نێوان ئەلفوبێی کوردی و لاتینیدا هەندێ هەڵە ڕووی داوە و من هەوڵم داوە ئەو هەڵانە، بە پێی بۆچوونی خۆم، چاک بکەم. لەبەرئەوەی ژمارەی هەڵەکان زۆر نەبوون، بە پێویستم نەزانی بە گوێرەی مێتۆدی تێکستۆلۆژی لە پەراوێزدا بەراوردیان بکەم.

سەرنجێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە، من پێم وایە تێکستەکە لە بنەڕەتدا زۆرتر بووە و لە کاتی بڵاوکردنەوەدا لێرە و لەوێ زۆر بەشی لێ لبراوە. لابردنەکەش ئاشکرایە کە سانسۆری دیکتاتۆریی سۆڤێتی سەپاندوویەتی. هەر بۆ نموونە هەرچی پێوەندیی بە کۆماری مەهابادەوەیە دەرهاوێژراوە.

---

*ئەم بابەتە لە ژمارە(11و12)ی گۆڤاری مامۆستای کورد کە لە بەرگێک دا لە سوید دەرچووە بڵاوکراوەتەوە.

# ئەدەبی کوردی سەربەرەوژێر دەڕوا

**هەژار**




چەندێك لەمەوبەر، جارێك لە گۆڤاری "بلێسە"وە پرسیارێك کرابوو کە ئایا ئەدەبی کوردی لەچ بارێکدایەو چی دوای خستووەو چۆن پێش دەکەوێت؟

جاوابزانم هەندێك لە نوسەران وەرامیان دایەوە، بەڵام من بۆ کلۆڵیم وەك کابرای کوردە ووتی: خەرمانم سوورکرد تاچووم لەدوی سەرکار کەو دەکونی کەو دەنکی لێ بڕی!! تابیرم کردەوە چ ڕۆژێك دەستم بەتاڵ دەبێ و دەتوانم کاتێك تەرخان کەمو وەرام بنوسمەوە، "بلێسە"ی خۆشەویست کوژایەوەو هەروەك گەلێ لە گۆڤارو رۆژنامەکانمان هێشتا تام لەژیان نەچێشتو بەکامی دڵ نەگەیشتو جوانەمەرگ کرا!! وائێستا دەمەوێ لە گۆڤاری "روناهی"دا کە هومێدێکی تازەیەو چاومانی روون کردۆتەوەو هومێدەوارین بەتەمەنێکی درێژو پڕ لەبەهرەوە بژی، بیروڕاوێژی خۆم لەو بارەوە دەربڕم...

مامۆستای سەجادی وەك باوکێکی زۆر دڵسۆزو منداڵ خۆشەویست کەلە هەموو شتێکا لایەنگری کوڕی خۆی دەکاو هەرگیز هیچ کەمو کوڕی لەودا نابینی وەرامی دابۆوە. مامۆستا شاکر فەتاحیش تاسەرێك بەرچەی ئەودا رۆیشتبوو، پاشان چاری پەرەپێدانی ئەدەبی کوردی خستبووە سەر پیاوەتی بێگانانو نانی هەنجنی بو بەهیوای شۆربای جیرانان، هەروەها دنەی خۆشمانی دابوو کە پێویستە ریز لە نووسەران بنێینو زۆرمان خۆش بوێن تابتوانن ئەوانیش بەدڵێکی خۆشو بیرێکی ئاسوودەوە گوڵو گوڵزاری ئەدەبیاتی کوردیمان بۆ بنەخشێننو بیگەشێننەوە.

هەردوو وەرامەکان زۆر جوانن، هەردووکیش دەتوانین بڵێین: ئاخ ئەگەر وەنەبا وەك سەجادی دەڵێو خۆزیا وابا وەك شاکر فەتاح ووتویە ئێستا ئەدەبی کوردی زۆر لەپێشەوە بوو، بەڵام داخەکەم هەرگیز ئاخو ئەگەرو خۆزیا شین نەبوونو بەرو سێبەریان بەکەس نەداوە!!

ئەدەبی کوردی راستە نەچۆتە ریزی ئەدەبی جیهانەوە چونکە ئێمە ریگەی کوردی نووسینیان پێنەداوینو چونکە خوێندەوارمان کەم بووەو چونکە گەل ریزی لە شاعرو نوسەران نەناوە، بەڵام:

ئایا کام گەلو تیرەیەك هەیە لە جیهان کە ئەمڕۆ لە هەموو بارێکەوە پێشکەوتووتر نەبێ لەسەد ساڵ یان لە **50** ساڵ لەمەوبەری؟

چونکە دیارە هەر کەس بەئەندازەی خۆی میراتێکی لە باوباپیرانیەوە بۆ بەجێماوەو کوڕ گەلیش لەسەر ئەو سامانەوە ساردو سەوداو گردەوە کۆییان کردووەو ئێستا هەم کەلەپورەکەی پێشویان ماوەو هەم لەسەریشیان داناوە، رێكو پێکێشیان خستوەو هەروا بەبێ ووچانیش تێدەگکۆشن رۆژ بەرۆژ پتری بکەنو پتر دڵخۆشو ئاسودە بن.

من هەر بیر لەوە دەکەمەوە کورد هەر ئەو کوردە بووە کە ئێستا هەیە. خۆ هەرگیز بەدرێژایی مێژوو رێگەی پێنەدراوە بەزمانی خۆی بنوسێ، خۆ کەس ریزی لە شاعیرو نووسەری کورد نەناوە، ئەی خوایە بۆچی لە ڕابردوودا پیاوی وەك مەلای جزیریو خانیو مەولەویو نالیو کێو کێمان لێپەیدا بووە، لە سووچی مزگەوتان، لەبن شاخو بەردان، بەنانی هەرزن، لەبەر رۆنگەرچەك، بەقەڵەمی قامیشو مەرەکەبی قورمی خانوو، ئەو ئەدەبیاتە بەرزو پڕ لە کاکڵو بەتامو بۆنەیان بۆ نووسیوینو بەمیرات بۆیان بەجێ هێشتوین، کەچی وێستا ئێمەی کوڕانی ئەوان لە خانووی سپیو بەرزدا، لەبەر شەوقی کارەباو مڕی پلاو گۆشتو بەخۆنووسە پەنجاویەكو مەرەکەبی پلیکان، هەرەی لە برەی ناکەینەوەو ناگەینە قولەقاپەی ئەو رابوردوانەو یەکێکی وەکئەوانمان لێهەڵناکەوێ دەگەڵ ئەوەش کە میراتەکەی ئەوانیشمان بۆ بەجێ ماوەو سی چل ساڵیشە کەم یا زۆر رێگەی کوردی نوسینیشمان پێدراوە؟!! ئائەمە نابێ وەك دەرویشان بیخەینە ملی قەزاو قەدەرەوە، پێویستە تۆزێك بەسەرو گوێلاکی خۆماندا بینین.

هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نیم کە شاعیرانی پێشومان بیریان لەوە کردبێتەوە کەئەگەر شیعر بڵێن دەتوانن چاپی کەن پارەیان لێ دەست دەکەوێ و پێ دەژین. تەنیا سۆزو ئەوینێك لە دڵیان خزیوەو مێشکیانی ئاخنیوە جاچ بۆ یاری دڵڕفێن یان بۆ نیشتمانی لەت لەت کراویان یاخۆ بۆ پیری تەریقەتیان بووبێ کوورەی دڵیان وا جۆشی ساندووە ناچاری کردوون دەری بڕن.

خەڵکەکەش دیتوویانە جوانەو بیستوویانە خۆشە، گۆرانییە مایەی رابواردنە، دەستاو دەست دەماو دەم وەریانگرتوەو داویانە بەیەکتر. خۆ ئەگەر خەڵاتی ئەو بوێژەشیان نەکردبێ جوێنیشیان پێنەداوە، جالێرەدا دەبوو مامۆشستا شاکر فەتاح نەیکوتایە ڕێزیان لێ بنێن دەبوو بیفەرموبا یا جوێنیان پێنەدەین. بەراستی بەڵای هەرە گەورەمان ئێیتا ئەمەیە هەر نوسەرێك یان شاعیرێکی بەرز کەدێ پەیدابێ و بۆنی ئەوەی لێدەکەی کەدەتوانێ خشتێك لەسەر دیواری ئەدەبیات دانێ و پەردەیەك لەناو ماڵەکەی هەڵاوەسێ، لەبەر جوێن پێدان و گاڵتە پێکردنی ئەم و ئەو، ناتوانێ سەر هەڵێنێ و خۆ بنوێنێ تادەمرێ بەجاسووس و هەرزەو شێت و سەرسەری دوای دەکەون ڕێی گەشەکردنی لێدەبڕنەوە. جائەگەر مردو دیتیان تازە دەگەڵ مردوو چ ناکرێ ئەمجا بەسەرو پۆڕیدا دێن ولینگی درێژ دەکەنەوەو دەیکەنە نەمرو دێنەوە چاو دەگێڕن کامە زیندوو ماوە کەلەوان باڵا دەستترە بیدەنە بەر لیستی جوێن و پاشملە گوتن و بەزمانی ناساز بیکرۆسنەوە.

پیرەمێردو فایەق بێکەس و سەلام و ڕەفیق حلمی و حوزنی موکریانیمان لە بین کەتا ژیابوون مراندبوویانن و کە مردن ژیاندوویاننەوەو پێیان دەڵێن نەمر. نووسەرو بوێرە چاکەکانی ئێستامان وەك گۆران و قانیع و سەجادی و شاکر فەتاح و شێخی خاڵ و ڕۆژبەیانی و کێ و کێ وائێستا لەو چەرمەسەرەدان و خەریکن بەدەردو داخەوە بیانمرێنن و خۆیان لێقوت کردووت کەنگێ لە ناودەچن تاچەپکە گوڵ بەرنە سەر گۆڕیان و پێیان بڵێن نەمرو ئەوەندە پارە لە میوانداریی بیرەوەرییان بەخت بکەن کە هەرگیز ئەو شاعیرانە ناویشیان نەبیستووەو ئەگەر هەریەك لەوانە دەیەکی ئەم پارەی بووایە ڕەنگ نەبوو بمرێ. جانازانم بوێرم وەك پیرەمێرد بڵێم ئەم دەردە گرانەمان لە حزی حزبێنەوە پێوە نوساوە یان نا؟!

### لاسایی منالانەش

دەبینین لە دێیەك بووك ئەهێنن: سوار سوار بووە رمبازی ئەکەن، داوەت دەگەرێ کەسك و سوور تێکەڵ بووە، شادیە، بوکێکی تەواو بەتارایی سورەوە بۆ ماڵی زاوا دەگوێزرێتەوە.

زاوایەکی زەبەلاحی چوارشانە گیڤەی سمێڵی دێ و دەچێتە پاڵ بووك. بەرهەمی ئەم هەراو گرمەو بەزم و ئاهەنگە پاش چەند ساڵێك چەند منداڵێکی زیت و خونچپیلانەیە.

منالیش لە گاڵتەی خۆیاندا ئەوان دەکەنەوە پەڕۆیەك بەسەر کچۆڵێکدا ئەدەن و یەکێکیش ناو دەنێن زاواو چەند منالێکیش سواری قامیش لە قەستی ئەسپەو بووك ئەبەن، بەلام پاش تاوێك بڕوانە هەر خۆشیان لە بیریان چۆتەوە چییان ئەکرد.

ئێمەش بیستوومانە ڕۆژئاواییەکان زۆر پێشکەوتوون، ژیانی پێشووی خۆیان تەواو گۆڕیوە، هرەچی هەیانە بەجۆرێکی باشتر تازە بۆتەوەو هاتۆتە روو، ئەگەر بەرێ بەسواری کەرو ئەسپ و عەرەبانە سەفەریان دەکرد ئێستا سواری گەرۆك و فڕۆك و کەشتی دەبن. دەسا بائێمەش چاو لەوان بکەین و بگۆڕێین، جاوەك فارسەکە دەڵێ: ئەگەر دەستت ناگاتە خانم کارەکەری چێشت لێنەریش هەر باشە.! خۆ ئێمە لە دەستمان نایە بازێڕو گوندەکانمان بگۆڕین و لە وزەماندا نیە بەگەڕۆك و فڕۆکی دەستکردی خۆمان بچینە ئەولاولا. دەسا ئەوی دەتاونین بائەوە بکەین: ئەدەبەکەی خۆمان وەك هی ئەوان لێبکەین. ئەگەر نەمانتوانی مەعناو نیازی وەك ئەوانیش بێنین قەی ناکا هەر کەسم و نیچمەکە حەسابە، دەوەرن بڕوانن باوکم: کوا ئەوان لە سەرەوتی فەعوولون فەعوول دەڕۆن؟ شیعری ئوروپایی نەقافیەی هەیەو نەوەزن. ئێمەش بالەسەر رەوتی ئەوان بڕۆین و زۆریش هاسانە. گوێ بگرە:

خۆشەویستەکەم
دەوێنێ ئێوارێ درەنگێک
هاتم
لە ماڵ نەبووی
بەڵێ نەبووی لە ماڵ
دەزانی؟
ئەی دۆستی گیانی
لە ماڵ نەبوون چییە؟
ئاخ و داخ لە ماڵ
بەڵێ لە ماڵ
نەبووی لە ماڵ

دە چەپڵەیەکم بۆ لێدەن وادارم دا بەڕۆحی شکەسپیریشیاندا، ئیتر چیتان دەوێ.؟!!

بریا کەسێك بوویە بەگوێی ئەم تازە کوڕانەیدا بسرکاندایەو بیگوتایە کاکە! ئەو کونەی تۆ دەستت پێدا کردووە جێمارە، چوێلەکەی تێدا نیەە!! ڕۆژاواییەکان کە باری ژیانی خۆیان گۆڕیوە، کەریان گۆڕیوەتەوە بەفرۆکە، بەڵام رەوت وهەوای شیعریان هەر هی هەزار لەمەوبەرە. شیعر ئەوەیە گەل بەگۆرانی دەیڵێ، گەلەکانی ڕۆژئاوا گۆرانیەکانیان شیعری ئاوای دەوێ، باری ژیانیان گۆڕاوە بەڵام زەوقی گۆرانیان نەگۆڕاوە، هاتون هەر لەسەر کرنەکەی خۆیان زیادیان کردوەو ڕێکوپێکیان خستووە لە گۆرانیی ساکارەوە خستویانەتە ناو مۆسیقاوەو لەسەر کاغەز دایانکوتاوە کە گوم نەبێ. بۆ نمونە لەناو لادێی ئازەربایجان گۆرانیەکی زۆر کۆن هەیە

کوچە باغی پێدەڵێن کەلە جێی حەیرانو لاوکی ئێمەیە. مۆسیقاری سۆڤیاتی هەر ئەوەیان تۆزێك دەسکاری کردوەو بۆتە سیمفۆنییەك کەلە ئەمەریکا جائیزەی پێوەرگیراوە.

تۆ کە خەیاڵی نوسینی تازەت هەیەو دەتەوێ وەك خوداپێداوان بکەی زۆر بیرێکی پەسەندە، منیش لەگەڵتام کە دەست لە فەعوولونو فەعوولو مەفاعیلون فەعوولات بەر بدەی کە ئەمە میراتێکی کۆنی دوابڕاوی عارەبانە لەبن عەباو عەگالەوە بەسواری حوشتر بۆمان هاتووەو بەسەتان ساڵە بەملمانەوە چەسپیوە. بەڵام ئەگەر ئەوت لە خۆت تەکاندو لە سواری کەر دابەزیت، ئەسپی ڕەسەنو مەحەندەکی خۆت لەبیر نەچێو بەپێ ملی ڕێ بگری بۆ ئەوبەری دەریایان بەتەمای ئەوە کەسێك لەوێ بەخێری خۆی لە پاش تەرکی خۆی سوارت دەکات. بەخوا ئەگەر وابکەی لە ئیشکاانیش دەرچی لەئاوا دەخنکێی!!

بۆیە دەڵێم دەست لە کلکی هەوای شیعری عەرەب هەڵگرە چونکە پێم وایە لە زەوقی کوردی گۆرانی بێژو گوێگر دورە. تۆ کە ئەوەم بۆ بەهەوای ئوروپاپی بگۆڕییەوە، بەسەد هەزار گوریسیش بەزەوقی هیچ کوردێکەوە نانووسێ!.

هەر گەلەی پێوەدانو ڕێوشوێنێکی هەیە بۆ شیعرو گۆرانی، کە عەرەب پێی دەڵێن (عەروزن)، کورد لە عەرووزی خۆیدا لەهەموو کەس دەوڵەمەند ترە. عەرووزە کۆنەکەی خۆت زیندوو بکەوە، خۆشتو ئەدەبەکەشت تازە دەبنەوە، ئەو هەزاران هەوای کوردییە کەلە گۆرانیەکانماندایە هەر یەکەی ڕەوتێکی شیعرو هونەرێکی جیاوازە. من چۆن بەتۆ دەڵێم تازە؟. من بەمەولەوی تاوەگۆزی دەڵێم تازە کە شیعرەکانی بۆ گۆرانیی هەموو گۆرانیبێژێکی کورد دەست ئەداو لەگەڵ پتر لە پەنجا هەوادا ڕێك دەکەوێ. دەتەوێ تازە بییەوە بچۆ شیعری بەمەعنای تازە بەهەوای بەیتەکانی کوردی، لەسەر ڕەوتی حەیرانو لاوك و لەشکریو خەزاڵ بڵێ، چی لە دڵتدایە بیخە ناو هەوایەکی کە کورد بەگۆرانی دەیڵێن تا بیبیستو بچێتە دڵیانەوەو بەم هۆیەوە باری ژیانی ناخۆشیان پێبگۆڕە...

کوڕە سەیری لە هەموو خۆشتر ئەمەیە: ئەگەر یەکێك لەو تازە کوڕانە بەدەستەواو پەسەندی ئەوی تر دەدا دەڵێ شاگردی مامۆستا گۆرانە کە مامۆستا گۆرانیش خاوەنی فێرگەیەکی تازەیە لە ئەدەبی کوردیدا!! دەسا قورئان بەهەقت، بەساحێبت، من تائێستا شیعرێکی گۆرانم نەدیوە کە وەزنو قافیەی نەبێ. وەباوەڕیشم وایە کە گۆران خاوەنی مەدرەسەیەکی تازەیە بەڵام فێڵەکەی باش دۆزیوەتەوە دەستی لە کلکی حوشترەکە بەرداوەو مەعنای تازەی خستۆتە ناو بەندو باوی کوردانەی خۆمانەوە. دەشیعرێکی بێوەزن قافیە-یان بەکوردی بڵێین- بێڕەوتو پاشڵی مامۆستا گۆرانم نیشان بدەنو سەرم بشکێنن.

کاکی خۆم! ئەوانەی کە داتان هێناوە شیعر نینو لە ترسی گێرە ناوی خۆیان گۆڕیوە، پەخشانیش نین چونکە پەخشان پارچە پارچەو بێمەعنا نابێت. ئەمانە وەك وشترمرغ وان ئەگەر دەڵێن بفڕە دەڵێ وشترم ئەگەر دەڵێن بابارت کەین دەڵێ باڵدارەم.

لە موکریان دەغڵێك هەیە سووریشەو وەك جۆ دەچێ ئەمە ناویان بۆ نەدۆزیوەتەوە پێی دەڵێن: "نەگەنم نەجۆ". جائەم نەشیعر نەنەسرانە چونکە ئەرك و بارگرانییەکی تازەو پێشکەوتووشە، سەری لە هێلکە جووڵاوە شاعیرەو شاعیری تازەو پێشکەوتوشە، ئەگەر زۆریش لەسەری بڕۆن دەڵێ شاگردی مامۆستا گۆرانیشمو هەر کەسیش پێم قایل نییە باسەری خۆی لەبەرد بداو تێر ئاوی سارد بخواتەوە.

### ئەمجا شاعیری زۆر و شیعری بەپەلە

حاجییەکمان هەبوو بەڕەحمەت بێ دەیگوت کورد یان هیند شل دەڕوا لەدوای هەموو کەسەوەیە یان هێند خۆش بڕوا کەسی پێ ڕاناگا. ئەگەر دەبێتە سۆفی چای ناخواتەوە دەڵێ سوورەو وەك شەراب دەچێ!! ئەگەر فاسقیشە بەری بەیانی لە خورێنی شوشەیەکی پڕ ئارەق دەخواتەوە.. ڕاستی دەکرد.

کورد یان نانوسێ وەك دەبینین بەهەزاران بەندو باوو چیرۆکی هێژاو بەنرخمان لەناوچووە چونکە هەر دەماو دەم گەڕاوە تافەوتاوە. کەسێکی خوێندەوارمان ئەوندەی نەتوانیوە سێ چوار ڕۆژ خۆی ماندوو کاو بیخاتە سەر کاغەز.




ئەگەر دەستیشی کرد بەنوسین بەیەکباز دەبێتە شاعیرو دنیا تێیدا شلو کوت بێ هەنگاوێك لە شاعیری نایەوتە خوار، تەنانەت عەریزە بۆ حکومەتیش بەشیعر دەنوسێ. لە هەوەڵ ڕۆژی کە دوو

پیت و لەتێکی ڕێك خست ئەوا دەست دەکا بەدەردی دڵی و دەڵێ: قەدری شاعیر نەماوەو بەخوا من و خانی و مەولەوی و نیزامی و سەعدی وەك یەك کلۆڵ و بەدبەختنتین!! لەبیرمە لە یەکێتی سۆڤیەت هەوەڵ پرسسیاری کەلەمەڕ ئەدەبی کوردییەوە لێم کراوە ئەمە بووە: ئێوە ئەو هەموو شاعیرەتان بۆچییە؟ بۆچی نوسەری چیرۆکتان هێندە کەمە؟ دەسا شیعر بەس بنووسن باشاعیرەکانتان دەس کەن بەنەسر نووسین.

پتر لە پەنجا جێگا ئەمەیان پێووتوم، منیش بەهەر درۆو مینگەیەك بووە خۆم ڕزگار کردووە لە دڵی خۆشما ئەمووت: ئێوە ئەگەر وائازان وەرن لە کوردستان ئەمە بڵێن تابەشیعر جوابتان بدەنەوەو هێندە شیعرتان بەسەردا بخوێننەوە گێژتان کەن و بەشاعیری بەڕێتان کەنەوە. بەڵێ شاعیرییەکە لەتام دەرچووە، خوای تۆ ئەزانێ مریشك دەنووك بەعەرزا بدات چاوو لووتی پێنج شەش شاعیری بەر دەکەوێ ئەگەر باوەڕ ناکەن لە مامۆستا گیوی موکریانی بپرسن کە بۆ جوابی مەتەڵێکی هێندەی جوابی بەشیعر بۆ هاتبووەوە کە تەنیا هەر شیعری هەشتاو چوار شاعیری چاپ کردبوو جێگەی نەمابوو ئەگینا خوا ئەزانێ تاکوێ دەڕۆیشت!!.

ئاهۆی شیعر وابڵاوبۆتەوەو پەرەی سەندووە کەس هەر بەلای پەخشانەوە ناچێ.! خەڵکەکەش هێندەی شیعر دیوە ئەگەر پەخشانێك دەبینن زۆر پێیان سەیرە. وابەشیعری زۆر یەرغە بوون هەر بەپەخشاندا ناڕوانن.!!

جاشیعریش وەك گوتمان: نەگەنم نەجۆ. قوربان لەو ڕۆژەوە ئەم شۆڕشەی تەمووزە رووی داوەو بەری نووسین بەرهەڵدا کراوە وەك پاش بارانەی بەهارم دێتە بەرچاو، کە دەڕوانی بەهەزاران شەیتانۆکە ژیاوەتەوەو شاخی دەرێناوەو دەجووڵێتەوە. ئیتر ئەوە هەر پەڵەیەو هەڵەیەو شاعیرەو دەرفەتێکی چوار فلس بایی دەکڕێ و بەشەوێك پڕی ئەکاتەوەو سبەینە ئەیباتە چاپخانەو دوو سبە لە بازاڕ فڕکەی دێ و لە پشتەکەشی نووسراوە: موژدە: واسیان چوارێکی ترم بەڕێوەن ئەم ڕۆژانە گەورەتان ئەکەم و بۆتان لە چاپ ئەدەم.

ئیتر بڵێی کەس خەتی بخوێنێتەوە یان کەس پێی وابێ لە خۆی باشتر هەیەو دەبێ پرسی پێ بکات،؟! کەوا بێ عاسمان کۆڵەکەی دەوێ. جا لە پاش لە چاپدان و بڵاوبوونەوەی دەبینی تووشی نووسەرێك دەبێ و بەفیزێکەوە لێی ئەپرسێ: ئەرێ تۆ ئەمانەی منت پێ چۆن بو؟! ئەویش خوام ئەو خوایە بڵێ پێم باشە نەبوو تا لە پاش جوێندان و سەرشکاندن بیکاتە پیاوی ئیستعمارو جاسووس و کۆنەپەرست.!!

ئەدەبی کوردی لە پاش شۆڕشی تەمووز کوڕە گوێ بووەو پەتی پساندووەو بۆتە کاسبیی ڕۆژانەی زۆر لە نووسەرە تازەکانمان من نەك پێم وایە بەرەو باشی دەچێ، بەڵکو پێم وایە سەربەرەوژێر خلۆر دەبێتەوە. خوا ئاگاداری بێ. ئامین..

بەڵێ گەلێك لەمانە وەك شەیتانۆکەی پاش باران و ئەگەر زەوی وشك بۆوە بەناو دەچن. بەڵام تازەوی وشك دەبێتەوە ئەدەبی کوردی زۆر لە نرخ دەکەوێ و خەڵکی دەرەوە لە باری ئەدەبەوە بەچاوی سوکمان لێدەڕوانن!!

**ئەی چار چییە**

بەبیری من چار ئەوەیە بەهەموو لایەك بەزەییمان بەخۆمان و بەنیشتمان و گەلەکەماندا بێتەوەو بەگەلەکۆمەکی دەست دەینە بەرباری خواری ئەدەبەکەمان و ڕاستی کەینەوە. بۆ ئەمەش چەند ڕێگەیەك هەیە:

1-**سەبرێك و دوو فوو**: ئەو کەسانەی دەست دەکەن بەنووسین پەلەی ئەمە نەکەم کە دەبێ هەر هەوەڵ ڕۆژی نووسینیان لە چاپخانە باوەشیان بۆ کرابێتەوە. دەڵێن: هەرچی زوو پێك بێ زۆر نامێنێ. بابنووسن زۆریش بنووسن بەڵام بچن و نیشانی نووسەرە بەناوبانگ و باشەکانی بدەن و بەدڵ لێیان داوا بکەن کەم و کووڕییان بۆ هەڵگرنەوەو ڕێ و شوێنی نووسینی باشیان نیشان بدەن. نابێ لەوە شەرم بکەن یان فیزیان نەیهێنێ. چونکە ئەگەر خراپیان نووسیوە باتەنیا یەکێك یان دوان پێ‌بزانن نەك بەخراپی لە چاپخانە دەرکەوێ و هەموو کەس گاڵتەی پێ‌بکەن و لە سایەی ئەوانیشدا بێگانە گاڵتە بەگەلی کوردو ئەدەبیاتەکەی بکات. من پێم وایە کەس لە ئێمە نایەوێ لە برناردشاوی ئیرلەندی تێ‌پەڕێنێ دەبا لەو بخوێنینەوە کە چلۆن تابیستساڵیش هەر نووسیویەو هیچ "دار النشر" نەبووە بۆی بڵاوبکاتەوە.

هیچ کەس لە پڕێك نابێتە کوڕێك. لە ڕۆژگاری پێشیندا کەسێك کە دەیتوانی وشە بهۆنێتەوەو هومێدیان لێدەکرد ببێتە شاعیر، دەبوایە بەلانی کەمەوە دەهەزار شیعری کۆن و نوێی لەبەر بکردایە. دەرسی عەرووزو قەوافیی بخوێندایە، هێشتا لەسەر ئەو حاڵەشدا لە دەیان نۆیان پووچەڵ دەردەچوون و لەگەڵ سەرنەدەکەوتن.

جا من دەڵێم بۆ ئەوە دەم نەسوتێ: صەبرێك و دوو فوومان پێدەوێ. کەم و پوخت نەك زۆر بێ و بۆر بێ. هەشت بێ و لە مشت بێ نەك نۆ بێ و نەبێ. دەبێ لە نوسیندا چاومان لەوەبێ کە ئەدەبی کوردی دەڕازێنێتەوەو خزمەت بەگەل دەکەین نەك بۆیە بێ کە زوو شازدەپەڕ پڕبکەینەوەو بیدەین بەپارە بۆ خەرجی ڕۆژانەمان. جوبران خەلیل دەڵێ: ئەو کەسەی بۆیە دەنوسێ پێ بژێ، نوسینەکەی بۆ خۆی ناژێ.

2-**مەعناو بیری ورد**: شیعر هەر ئەوە نییە وشەیەك ڕێك خرێ و لێك بدرێ و پاشڵ و ڕەوتیار وەك یەك بچێ. ئەو کابرایەی کە ووتویە: "بەژنت ڕەشە ڕێحانە لەناو پەیینا چەقیوە-بێنە ڕەفیسکەت ماچ کەم هەناری حووحووی پێوە" لەباری ڕەوت و قافیەوە کەمایەمیی نییە بەڵام مەعنای تێ نەخراوە. کەوابوو تەنیا وشە لێکدان بەش ناکاو بەو کابرایەش ناتوانین بڵێین: شاعیر. شیعر

ئەو باریك بینییەیە كە خەڵكی ڕەمەكی ناتوانن بیری وابكەنەوەو شتی وابڵێن. تۆ بڕوانە: بەهەزاران ساڵە عەرەب خورمایان هەیە. كەس بەبیریدا نەهاتووە وەك نالی بڵێ: یارەكەی من وەك خورما وایە شیرینەو سنگی نەرمەو دڵی ڕەقە. بەم بیرەوردەیە دەڵێن شیعر كە هەموو كەس ناتوانێ بیڵێ. جاكە بیری ورد هەبوو ئەمجا هەوایەكی ئاوازو گۆرانیی دەوێ‌و هەروەها چەند وشەی نازك‌و لەبەردڵانی پێ‌لازمە تابەهەموان، یەكتر تەواو دەكەن‌و دەتوانن ناوی بنێین شیعر. بیری ورد لە شیعرا بووكە، هەوای خۆش‌و وشەی تەڕو پاراو جل‌و خشڵیەتی. جل‌و خشڵی بێ بووك‌و بووكی بێ جل‌و خشڵ خۆی نییە.

3-كۆنە پەرستی: دەبێ چاوێك لە گەلانی خوداپێداو بكەین، بزانین ئەوان دەگەڵ ڕابواردنی خۆیان چۆنن ئێمەش وابین. نابێ ئەدەبی كۆنمان لەبیر بەرینەوەو بڵێین دنیا تازە بووەتەوەو باوی نەماوە. دەبێ بیانخوێنینەوەو بەغاریش بەسەریاندا نەڕۆین‌و وردبینەوەو تێیان بگەین‌و بەشی خۆمانی لێ هەڵێنجین‌و لەگەڵ ئەدەبی تازەدا بیگونجێنین. بۆ نموونە: جارێك كتێبێكم خوێندۆتەوە ناوی "منطق الطیر"ە، فەریدالدین عەتار لە چەرخی حەوتەمی هیجریدا نووسیویە، هەموو باسی دەروێشایەتییە، ناواخنەكەی زۆر بەكورتی ئەوەیە:




"باڵداران لێك كۆبوونەوە گوتیان: هەموو تیرەی جانەوەرێك پادشایەكیان هەیە. بۆچی دەبێ هەر ئێمە نەمانبێت؟! كەوتنە مقۆ مقۆ كە كێی واهەیە شانی هەڵبگرێ‌و بیكەینە پادشای خۆمان؟! پرسیان بەپەپووسلێمانە كرد گوتی: ئەو كەسەی بۆ پادشایەتی دەگونجێ ناوی سیمرخەو لەكێوی قافە، ئایا دەتانەوێ بچین‌و ڕووی لێ بنێین كە ببێتە پادشامان؟ هەموو تێكڕا گوتیان ئامادەین‌و زۆرمان پێ‌خۆشە. كێوی قاف لە كوێیە تابچین؟. پەپوو گوتی كێوی قاف زۆر دوورە حەوت دەریاو حەوت بیابانی لە پێشە. دەریاكان پڕ شەپۆل‌و مەترسی‌و بیابانەكان پڕ لە تۆزو ڕەمڵی گەرم‌و بێ‌ئاون، مردن لە هەموو لایەكەوە چاوەنۆڕمان دەكات، بەهەزاران نەهەنگ‌و هەژدیها لە دەریاو وشكانیدا دەمی بۆ كردووینەوە هەڵمان لووشێ. ئەگەر گوێ نادەنە ماندووبوون‌و برسیایەتی‌و مردن فەرموون دوام كەون بابچین. كەو- وەرامی داوە: من كابرایەكی زێڕ خۆشەویست‌و هەمیشە لەو كێوو كەژانە لە كانگای زێڕ دەگەڕێم بەخوا نایەم لەگەڵتا.!! شاهۆ-وتی من صۆفیلكەم لەدەم دەژیم ڕۆژێ چەند جار خۆم ئەشۆم‌و دەسنوێژ ئەگرم. بەخوا ئەم تۆزو خۆڵە بۆ من نالوێ. كۆتر هەڵیدایە: من دەبێ هەموو مانگ دوو منداڵ بەخێو كەم، من بڕۆم كێ گەنم‌و دان بۆ منداڵم دێنێ‌و كێ بەخێویان دەكا؟ ناتوانم بێم.

ئیتر هەر باڵدارێك بڕو بەهانەیەك پەیدا دەكاو بۆ پادشا واز لە ژیانی هەمیشەیی‌ی خۆی ناهێنێ جگە لە چەند باڵدارێكی ڕووت‌و پووتی بۆری چڵكن كە ئەمانە هیچ خۆشییەكیان لە ژیاندا نییەو شتێكی وایان لە پاش بەجێ‌نامێنێ چاویان لە دوو بێ. دەڵێن ئێمە ئامادەین گیانی خۆمان ببەخشین‌و هەژدیهاو نەهەنگ قووتمان بدا، تەنها بەهومێدی ئەوە كە چاومان بەپادشای خۆمان بكەوێ هەموو شتێكمان لەلا هاسانە."

جائەمە كورتەی كتێبێكی چوارسەد پەڕەیە كە بۆم باس كردن. كتێب ئەوەندەی باسی فیداركاری‌و خۆ بەخت كردن لە ڕێگەی نیازا تێدایە كە هەر مەپرسە ئایا ئێوە لەگەڵ من نین؟. كە ئەم كتێبە بۆ ئەوە دەبێ بەشی هەزار شیعری تازەی لێ هەڵێنجی؟. عەتار كە بۆ نیازێكی گوتووە تۆ بیخە سەر نیازی خۆت‌و بۆ نیشتمان پەروەریی دەكار بێنە.

دەسا با كۆنە فڕێ نەدەین‌و بڕوانین پێشینان چییان بۆ نووسیوین لێیان بخوازینەوەو نەخش‌و نیگارێكی تازەی بە بەردا بكەین‌و بەهرەی لێ‌وەرگرین، ئێستاش سەدی سەد ئەدەبی ڕۆژئاوا لە ئەلیازەی هۆمیرۆس‌و لە تەوراتەوە سەرچاوە هەڵدەگرێ. تۆ بێنە دیوانی مەلای جەزیری بخوێنەوەو تێ‌بگە ئەو ئەوین‌و دڵدارییە بەسۆزەی كە ئەو بۆ دڵبەرەكەی دەكار كردووە تۆ دەرسی لێ وەرگرەو بەو سۆزەوە دڵداری نیشتمانت بە. وەك مەم بمرە بۆ زین بەڵام با زینەكەی تۆ كوردستان بێ. ئازیزی مەولەوی كەسێك بووە با ئازیزی تۆ هەموو كوردێك بێ. حەبیبەكەی نالی با ببێتە هەستی ئازادی لە لای تۆ. ئەگەر ئێمە دەست لەم كۆنە پەرستییە هەڵگرین‌و تازەشمان ئاوا نە گەنم نە جۆ بێ، بە خوا وەك كوردەكە لە هەردوو چێژنان بێبەشین!!

4- لێكۆڵینەوە: دەڵێن كەس نەیدیوە كۆتەڵێك بۆ"ناقد"ێك چەقابێ. بەڵام گەلێك كۆتەڵ بۆ شاعیرو نووسەران بەرز كراوەتەوەو

تاشراوە. ئەمە بە رووالەت راست دێتە بەر چاو بەڵام نابێ لە بیرمان بچێ كە ئەو گەلەی ناقدی ئەدەبی نەبێ شاعیرو نووسەری هەرگیز تێدا هەڵناكەوێ. باغچەیەك ئەگەر سەرپەرشتی باش نەكرێ‌و باخەوانێكی زاناو بە سەلیقەی لەسەر نەبێ كە هەمیشە بژاری بكاو گیابۆگەنەو فریزووی لێ فڕێ بدا، باوەڕ ناكەم ئەو گوڵزارە گەشە بكاو ببێتە سەیرانگایەكی خۆش‌و بەرچاو.


لە چاپكراوەكانی كۆڕی زانیاری كورد

دوكتۆر مستەفا جەواد

هۆزی لەبیركراوی "گاوان"

و

گاوانییە بەناوبانگەكان

ئەندامی كاری كۆڕ

هەژار

كردوویەتە كوردی

چاپخانەی كۆڕی زانیاری كورد

بەغدا – ١٩٧٣

بەلی با نەلین باخەوانەكە جوانەو بۆنی خۆشە بەلام هەموو كەس دەزانی ئەمە كارزانیی باخەوانە كە گولی جوان‌و بۆنخۆش هەیەو گیا و گژی پیس و بۆگەن فڕێ دراوە.

گولزاری ئەدەبیاتی كوردیش بژار چنی وای دەوێ كە چاولی لێ نەترووكێنێ و كەمتەرخەمیی تیدا نەكا و پیسی لێ فڕێ بدا و جوانیشی نیشانی خەلك بدا. هەتا ئەو بژاركارەش پەیدا نەبێ هیچ هومیدم نییە ئەدەبی كوردی بێتە بەرچاو و پەرەبستێنێ. پیویستە بەلانی كەمەوە دوو كەسی زۆر باش و بەهێز لە نووسەر و شاعیرە بەناوبانگەكانمان خۆیان و قەلەمیانتەرخان بكەن بۆ بژاركردن و لیكۆلینەوە. هەر نووسینیكی كە تازە دەردەچێ چل پشكنی بكەن و بژارچنی لێ وەكارخەن و فریزووی لێ دەراوین و دەوری گوڵان چۆڵ بكەن تا ریگەی خۆنواندنیان ببێ. ئیتر نابێ چاویان لەوە بێ ئەم نووسینە هی كییە ین كێ گوتوویە؟ كاسەجیرانەتی بۆ جیرانان نەبەن. روویان لە كەس نەئیشێ. گوێ لە گلەو گازنی ئەم و ئەو نەگرن، بە گوناهبار و تاوانداریش هەر ئەلین عافەریم. دەبێ خراپان ئیعدام بكەن بۆ چاوترساندن و پاشان خەلات بكەن بۆ دلخۆشكردنی باشی تر.

رەنگە لە وەرامی ئەمەدا بلین نووسەری ئیمە ئەمە فیر نەبوون. ئەگەر لییان بكۆلینەوە تووڕە دەبن و جوینمان پێ دەدەن. ئیمە سەری ئازای خۆمان لە پریسكەوە بپیچین؟. بەلێ ئەمە راستە تووشی دەردی سەرییەكی زۆر دەبن. بەلام من دەلیم: نووسەری دلسۆزی وا لەسەریان پیویستە ببنە "ناقد" كە ئەدەبی كوردی بە هی خۆیان دەزانن و ئەدەبیاتە تازەكەمان وەك منالیخۆیان تماشا دەكەن، ئەو كەسانەی منالیان تووشی كوان و كەچەلی دەبێ و دەرمانی دەكەن، منالەكە دەگری ودەست ئەوەشینێ و جوین دەدا. بەلام دایك وباوكی منال خۆشەویست گوێ نادەنێ و دەرمانی هەر دەكەن تا چاك دەبیتەوە... منالەكەش ئەگەر گەورە بوو عەقلی پەیدا كرد دەزانێ باوك و دایك كە رۆژی خۆی ئیشاندوویانە قازانجی ئەو بووە.. لە جویندانەكەی خۆی زۆر پەشیمان دەبیتەوەو بە دڵ سوپاسی ئەو دەرمانكردنە دەكا.. پیم وایە ئیمە چەند بژاركاریكی وا دلسۆزمان دەوێ دەرمانمان بكا و لەش ساغیی ئیمە بە قازانجی خۆی بزانێ و هیندەش پشووی لە سەرەخۆ بێ تا گەورەمان دەكا و ئیمەش هەتا هەتایە سوپاسی دەكەین. وە هەتا چەند كەسیكی وامان بۆ پەیدا نەبێ نابێ چاومان لە ئەدەبیاتیكی باش و پوختە بێ..

سووچیكی زۆر گرنگی تریش لە ئەدەبیاتیدا هەیە كە ئەویش گۆرانی و مۆسیقایە. بەلام ئەو لایە چونكە سەر وە رادیۆیەو رادیۆش هی خۆمان نییە و ناتوانین دەسكاریی بكەین و چاكی كەین، ئەوانەی كە رادیۆكەشیان لە دەستایە هیچ قازانجیان لەوەدا نییە كە بەهرەیەك بەگەل بگەیینێ لەبەر ئەوە ئەم باسەم دواخست بۆ رۆژی خۆی كە نازانم ئەو رۆژەش دەبینم یان نا؟...

هویمدەكەم: كە بە چاویكی لی بووردنەوە تماشای ئەمانە بكەن و بزانن كە بە دلسۆزی نووسیومن...

* * *

ئەم وتارە یەكەم جار لە گۆڤاری روناهی، ژمارە -1-سالا-1- چریا ئیكی 1960 (ل: 59-76)دا بلاوكراوەتەوە. دواتر جاریكی دیكەش لە لاپەرە (42-47)ی ژمارە 14ی ریكەوتی مامۆستای كورد لە سوید بلاوكراوەتەوە.



# حاڵی عەرزم بووی ؟!

ئێمەش کوردایەتیمان کردوە. بۆ نەمان کردوە؟. ئەی گوایە ڕۆژی خۆی، لە بەچکە شێرانی هیوا نەبووین؟!. هەموو ڕۆژێك، حاڵی عەرزم بووی، سەر لە بەیانی سروودی ئەی کوردینە ئەیمەدینە.. دوو شەش هاتییە خوار؟!.. مەترسە ئەویشم هەیە. بە خوا هەتا ئێمە کورد بووین، حاڵی عەرزم بووی، کوردایەتیمان دەکرد، نازانم ئەو خەڵکە.. دەی دەی دەزانم دووبارەت پێیە.. وەرە خوار.. کێ بە قەد من مەناشیری بە دیوارانەوە نووساند؟. کێ بە قەد من شورتەو ئەمن راوی ناوە؟!. بە خوا بەشی خۆشمان، حاڵی عەرزم بووی، بە شاخ و کێوانیشەوە... ها ئەوەش بەیاز بۆ خاتری تۆ.. کەچی ئێستا هەر قسە دێتە ناو قسەوە، ئەو دەڵێ من پێشمەرگە بووم .. تۆ چ بووی؟ ئەم دەڵێ، حاڵی عەرزم بووی، من سنگم بە گوللەوە بکێشە.. بکێشە.. دەزانم پێت نییە نازانم ئەو خەڵکە بۆچ لایان وایە ئێمەمان لە بەر سێبەری دارگوێز نووستووین و هیچمان نەکردوە ئەی گوایە حاڵی عەرزم بووی، پەروەردەکردنی. ئەوا من بەم چوارە بەستم. کەس نییە لەوانە بپرسێ: ئێوە لە چیا چیتان کردو ئێمە لە شار، حاڵی عەرزم بووی، چیمان نەکرد؟! ببژێرە.. من حەفتاو شەش بووم. کەس تا ئێستا دۆمینەی لە کاکی خۆت نەبردۆتەوە. با تیزمان پێبکەن و، حاڵی عەرزم بووی، لیچمان لێ هەڵ قرچێنن!. چەند ساڵ و زەمانە، رەنج دەدەین و لە دەرز گوتنەوەدا خۆمان پیرو کوێر کردو توانا و جوانیی خۆمان لە دەست دا.. کاکە دوو چای جوان بۆ ئێمەو بزانە ئەم برایەش چ دەخواتەوە..

مامۆستا تەوفیق ئقمانەی بە سیرعەتی سەد کیلۆ میتر لە سەعاتێکا لە دەم دەردەپەڕین.. نەمزانی لە کەیەوە ئەم باس و خواسەی دامەزراند بوو.. وا دیار بوو دەمێکە لەگەڵ هاوڕێکەی وا خەریکی دۆمینەیەو بە دەم کایەکردنیشەوە، لەسەر ئەو فەرمایشتە رەنگین و پڕ لە پاکانەی خۆی دەڕواو دەردی دڵ بە دەم بادا ئەدا . مامۆستا تەوفیق لەوانە نییە هەرچی جارێکی دیتبێ نەی ناسێتەوە.. هەرگیز دەگەڵ خەڵکی رەمەکیدا لێت ناگۆڕێ.. درێژە، باریکە، تۆزێکیش خوارو خیچە، لووتێکی قەپۆزبەرانم و دەمێکی پەلی هەیە. پشت ملی چڵکن و بە گنچە. سەرێکی درێژۆکەی بێتووك و لووسی بەو ملەوە نووساوە، کە زۆر لە کەللە سەری ئاوەڕووت کراوی پاچە دەچێ!. ئەوانەی غەرەزێکیان دەگەڵی هەیە، دەڵێن هەر زگماك کەچەڵ بوە!. بەلاّم وەك لە خۆیم بیستوە، هەر لە خەم و خەفەتی زەمانەی بێ بەقاو تۆزێکیش لە ئەنجامی گرانەتاوە، تووك مانا بە سەریەوە نەماوە. دەنا لە چاخی خۆیدا، شانەی ئاسنیش لە کاکۆڵیدا شکاوە. جا وەك هەمووومان دەزانین، زۆربەی ئەم خەڵکە عەقڵیان لە چاویاندایە. وە لە هیچ و خۆڕایی پێستە سەری کەچەڵیان پێ سەیرە. ئیتر کەس ناڕوانێتە مێشکی پڕ بیروباوەڕی ناو سەری هەڵکەوتەو بلیمەتان. مامۆستاش بۆ داپۆشینی ئەم دیمەنە، جاران سەرە لووس و سپییەکەی دەخەنە دەگرت و دیمەنێکی شڵەی پنۆکی جوانی پێدەدا. بەلاّم ئێستاکە بە ناودا چووەو تاقەتی خۆ جوان کردنی نەماوە. سدارە لەسەر دەنێ و پیاو هەق بڵێ زۆر لە سەرڕووتان بە ویقار ترە.

ئاشنایەتی من و مامۆستا تەوفیق زۆر بە بنج و ریشەو شە مێژینە. وەك من لە بیرمە شازدە ساڵە دەیناسم. بەلاّم وا دیارە ئەو بیری زۆر لە من تیژ ترەو لای وایە لە زەمانی کۆمەڵەشدا لەو سەرە پێکەوە دۆستی گیانی بە گیانی بووین و من لە بیرم نەماوە!.. واتا ئەگەر ئەو راست بکا، لێشم روونە پیاوی درۆ نییە، بەو پێیە دەبێ تەمەنی دۆستایەتیمان خۆی لە بیست و ئەوەندە ساڵ دابێ!

شازدە ساڵ لەمەوبەر، کە بە حیسابی من بۆ یەکەم جارو بە حیسابی ئەو بۆ دووهەم جار، یەکترمان ناسی. لە گەڕەکی(ساری کەهیە)ی کەرکووك، لە چاخانەکەی مام مارف بوو، کە چاخانەیەکی پەرپووت و هەژارانەو تەریك و لە کۆڵان و هەرزان و خۆماڵی بوو. ئێواران کە لە دوای کاری کاری رۆژانە، دەگەڵ چەند کرێکارێکی دیکە لەوێ کۆدەبووینەوە، مامۆستا تەوفیق هەمیشە گوڵی مەجلیس و نوقڵی سەر سینیمان بوو. تاوتاوێك کە تەواو بێزانیبا بیچگانە بەدەرەو کەسی وای لێ نییە نامۆیی لێبکرێ، کتێبێکی یاساغی لە باخەڵ دەردێناو بە بەرچاوییەوە دەنا. ناوی کتێبەکە بە خەتی درشت رووی دەکردە ئێمەو تەواو لە متالاّدا غەرق دەبوو.

ئێمەی بەسەزمان کەسمان گومانمان لەوەدا نەبوو، کە ئەو عەقڵەی لەپێڵاوی مامۆستادایە لەسەری ئێمەدا نییەو، ئەوی ئەو لە بەری ماوەتەوە خواردنی هیچ کامێکمان نییە. سەد خۆزگەمان دەخواست کە هیچ نەبوایە سەدیەکی مامۆستامان بزانیبا. لەو کاتانەدا کە لە خوێندنەوە پشووی دەداو دەی دواندین، ئەوسا وو کە بلیمەتی خۆی رادەناو تێی دەگەیاندین کە ئەو ریشەی لەبەر هەتاو سپی نەکردوە. ئیمپریالیزم.. فاشیزم.. بیرۆکراتی. رادیکالی و هەزار وشەی وای بۆ ریز دەکردین، کە ئێمە هەر دەبوایە بە واق وڕمانەوە تەماشای دەمی کەین و سەرمان لە کاروباری خوا سوڕبمێنێ و بەبێ ئەوەی دەنکێکی لێ تێ بگەین بەڵێ وایەی بۆ بڵێین. بەڕاستی بەلامەوە سەیر بوو، ئەم کابرایە چۆن توانیبووی ئەو هەموو وشە رەق و تەقانە وا لەبەرکاو وا بەپەلە بیان لێ و هەرگیز زمانی گرێ ناکا.

با ئەوەشم لەبیر نەچێ، هەوێن و سەروبنی فەرمایشتەکانیشی، رستی (حاڵی عەرزم بووی) بوون کە زۆر جار هێندێك

گوێ گری گێل و هەرزەکار، دڵۆپەیان دەکردو بەو تەکیە کەلامە شیرینەی پێ دەکەنین و مامۆستایان تووڕە دەکرد.

جا هەروەك باسم کرد، چونکە بە حیسابی ئەو من ئاشنای زۆر لە مێژینەی بووم و دووبارە بە دیداری یەکتر شادو شوکور ببووینەوە، رابوردووی پڕ لەشانازی خۆی دەگێڕایەوەو ئەو قارەمانەتی و گیانبازیانەی بە گوێ هەڵدێناین کە لەزەمانی کۆمەڵەد کردوویە، منی کلۆڵی وەك شایەتێك دەست نیشان دەکردو دەی گوت ئەگەر باوەڕ ناکەن لە فڵان کەس بپرسن. دیارە لەو وەختانەشدا نەدەکرا بڵێم: ئاگام لێ نییەو ناچار بووم بە درۆ وەبالی بۆ بکێشم و بڵێم راستە.

سەرت نەئێشێنم ئەوەندە هۆگری یەکتر ببووین کە هەر باسی ناکرێ. زۆربەی کاتی بێ کاریمان پێکەوە رادەبوارد. ورده ورده، دۆستایەتییەکەمان گەیشتە پلەیەکی وا کە هیچ شەرمە حزووری و رووبینیمان لەناودا نەماو ئەگەر کەسی غەیرەمان لەلانەبا، تەواو دوور لەدوورووویی و ریابازی دەژیاین و لەبن پەردەی چاپ و چووپ و خۆگۆڕیندا، خۆمان لە یەکتر نەدەشاردەوەو هەرچۆنێك بووین ئاوا خۆمان نیشانی یەکتر دەدا. جا ئەوسا بوو کە بۆم دەرکەوت، مامۆستاش هەر بنیادەمە خۆمانەیەو ئەوانەی ئەو دەیان لێ ئێمە تێ ناگەین، بۆ خۆشی مانای هەموویان نازانێ. بەڵام بەزیرەکی و بلیمەتیی خۆی، وای خۆ نیشان داوە کە خەڵك واتێ نەگەن شەندە لە مەندە کەمترەو ئەوی ئەو ئەفەندیی و مەفەندییانە دەمی بۆ دەبەن، ئەویش دەی زانێ و لەوانیشی تێپەڕاندوە. بۆ ئەوە ئەم مەبەستە باشتر روون بکەمەوە، ناچارم (هەرچەند بەزیانی خۆشم تەواو دەبێ) ئەم چیرۆکە بگێڕمەوە:-

ڕۆژێك کە هەر خۆم و خۆی بووین، بەتۆزێك منجە منج و لاسەر خواردنەوە عەرزم کرد: مامۆستا زۆر شت لە ناو فەرمایشتەکانتدا دێنە بەرگوێم، هەرچەندە هەر گوتوومە بەڵێ وایەو خۆم وا نیشان دەدەم کە من لەو سەریەوە دێمەوەو باشیان دەزانم، بەڵام دەبێ لێم ببووری -زۆریش خەجاڵەتییە بۆ من- راستت دەوێ لە زۆریان هەر تەقەم لەسەریەوە دێ و لام وایە گوێزم بۆ دەبژێرێ. حەرام ئەگەر تێ گەیشتبم چیت فەرموە. ئەگەر لەبەرت گران نەیە، حەز دەکەم چەندێك لەو وشە رەق تەقانەم بە کوردییەکی هاسان تێبگەیەنی و لێم لە هەرا نەدەی زۆر سوپتست دەکەم.

_وەك چی؟!.

_وەك: دیماگۆگی، کۆمپەرادۆرو بە تێکڕایی زۆربەی ئەو فەرمایشتانەش تێك و لیزم و لیستیان بە کلکەوە هەڵواسراوە.

_بە خوا شتێکی سەیرە!.. ئەم وشانە، حاڵی عەرزم بووی، حەزرەتی فیلیش نازانێ بەری چ دارێکن. مردووت مرێ.. سەری خۆت بە چییەوە دێشێنی!.. بڕۆ تۆش سایری ئەو خەڵکە.. بەبێ مانا زانین لە وەخت و بێ وەختدا، بیان لێ و بیان لێوە تا بڵێن زانا و فەیلەسووف. خۆ ئەگەر بتوانی، حاڵی عەرزم، چاوێلکەیەکی شووشەش بکڕی و بە بەر چاوتییەوە بگری، ئەو نووری عەلا نوورە. ئەمما ئەوە هەر بە تۆی دەڵێم، چونکە تۆم خۆش دەوێ. نەچی، حاڵی عەرزم بووی، خۆت شێت کەی و لە لای عالەم بڵێی مامۆستا تەوفیقیش ئاوا... تێدەگەی دەڵێم چی؟!...

ئیتر خوا بت حەسێنێتەوە.. لەو ڕۆژەوە مامۆستا تەوفیق کلیلی دەرگای گاڵەدراوی ژیانی ناو کۆمەڵەکەکانی دایە دەستم و ئەو ئامۆژگارییە بەنرخەی ئەوەندەی لە دنیا تێگەیاندم، کە لە هەموو ڕۆژگاری خوێندنمدا لە مەدرەسە فێری نەببووم. وا لەو ساوە لە هەموو کۆڕو مەجلیسێکدا باس لە هەر شتێکەوە بکرێ، ئیتر بێزانم و نەیزانم خۆمی تێهەڵدەقوتێنم و هەرچی لە دەمی هەر کەسەوە دەرچێ، هەر لە حەوا دەیقۆزمەوەو گورج لە خۆمەوە جوابێکی بۆ دەدۆزمەوەو بۆ ئەوەش کە تێم نەگەن و نەزانینەکەم پینە بکەم، کۆشێکم وشەو رستی رەق و تەقی بێگانەو دوورەدەست لەبەرکردووەو لە پەستا بە سەرو گوێلاکی گوێگرە خۆشەویستەکانیدا دەدەم و گێژیان دەکەم و بۆ خۆشم هەرگیز گنج مانا چییە، نایەتە ناو چەوانم. ئاوا لە سایەی ئامۆژگاری مامۆستای بەڕێزەوە، وام لێهاتوە کە ناوبانگی زاناییم وەك کەری چەرچی سەر بە هەموو ماڵاندا دەکا و بیلاتەژبی، پەرژینەکە بە گوڵ بێ فەیلەسوفێکم ئاو لێڵ ناکەم.

بەڵام نامەوێ وا بزانن کە مامۆستا، هەر لە وشەی رەق و خۆگۆڕیندا سەرکەوتوەو بەس. خوا هەڵ ناگری لە کوردایەتیکردنیشدا، هەر خۆی یەکە سواری مەیدان بوو. بە تایبەتی ئەگەر هەر دوو بە دوو بووینایەو یەك دوو پێك ئارەقی ئەبوو کەلەبچەشی گیر بکەوتایە کە خۆی ناوی نابوو_شێری شێران_ ئیتر هەر مەپرسە.. لە کوردایەتیکردندا چۆنی گول دەکرد:

*کورم.. برام.. کوردایەتی گاڵتەی مناڵان نییە.. هەر دەم ڕووتك راستەوەبێ، حاڵی عەرزم بووی، سینگ داچەقێنێ و بڵێ شێلە واو بێڵ وا.. ئەو کوردستانە کوردستان.. ئەو کوردستانە دابەش کراوو، حاڵی عەرزم بووی، داگیرکراوە پیاوی دەوێ، خوێنی دەوێ، هەزاران گەنجی وای دەوێ، حاڵی عەرزم بووی، کفن هەڵگرێ و خۆی نەزری ئازادی کوردستان بکا. هەتا کوردستان بە یەکجاری لە ژێر باری، حاڵی عەرزم بووی، دیلێتی دەرنەچێ، کەس نابێ ئاوڕلە خۆی بداتەوە. وەك فەیلەسوفەکە، حاڵی عەرزم بووی، دەڵێ پیاو دەبێ وەك مۆم بسوتێ و تاریکی لەسەر هەزاران برەوێنێ. ئەم مامۆستایەی خۆت کە لەبەر چاوتە_* مەدحی خۆشم ناکەم_ بە سەری تۆ نا، بەو سەرەی خۆم ئەوەی بۆ کوردم کردوە، حاڵی عەرزم بووی، بە لەشکرێك ناکرێ. مامۆستا بووم.. چنگێك معاشم وەرئەگرت_ بۆ خۆشت دەزانی ئەو دەم چەند هەرزانی بوو_ گوتیان لەو سەرە، حاڵی عەرزم بووی، کۆمەڵە پەیدا بوە..

شەقم لە وەزیفە هەڵدا. التحاقم کرد. پێشمەرگە بووم. برسێتی .. تینوێتی.. مەڵێ سەرخۆشە، سەرخۆش نیم.. حاڵی‌ی عەرزم بووی، شەڕ.. هەرا.. بەراوبەر کردن.. سەرما.. گەرما.. بۆ کێم دەکرد!؟.. بۆ میللەتی خۆم.. چەند جار منت بە جلکی پێشمەرگەوە دیوە. کەچی نازانم نیازت لەو چی‌یە کە دەڵی‌ی لە بیرم نەماوە.. قەیدی نی‌یە.. رۆژێك هەر بە بیرت دێتەوە.. ئاخ.. سەد ئاخ.. بە خوا ئەگەر کوردەکە خەیانەتی نەکردبا، خوا ئەی‌زانی ئێستە، حاڵی‌ی عەرزم بووی، بەشتێکی دیکە دەبووین. بەڵام داخەکەم کوردەکە هێشتا وای لێ نەهاتوە قەدری ئازادی بزانێ.. رۆژێك هەردێ کورد رێگەی خۆی بزانێ. ئەوسا چاووت لە مامۆستا تەوفیقت بێ بزانە چۆن، حاڵی‌ی عەرزم بووی، خۆی دەردەخا. هەرچەندە هێندێك کەسی تێنەگیشتوو لایان وابوو مامۆستا پیاوێکی خەیاڵاوی‌یەو هەرگیز لە قون تەندوور وەلا نەکەوتوەو دەستی بە کلاوی خۆی‌دا گرتوە با نەی‌باو وەك توولە نەمام دەگەڵ هەموو بایەکا دەلەرێتەوەو لە قسەی زل بەولاوە، چی دەبارانداا نی‌یە. بەڵام بە ئێمە چی؟!. پێشینە نەیان گوتوە، ئامۆژگاری لە دیواریش نووسرابێ هەر باشە؟!. من زۆرم بەهرە لەو فەرمایشتانەیەوە پی‌گەیشتوەو بەو ئەمەکداری‌یەش لە پاش ئەو چەند ساڵە، واهاتووم دیدەنی بکەم.

**_مامۆستا گیان تەندروستیت لە چیدایە؟!.**

_تەندروستی چی‌و تەڕەماشی چی.. لە سلیەی ئەم منالانەی کە دەستیان پی‌کردوەو کوردیمان، حاڵی‌ی عەرزم بووی، لێ دەگۆڕن ئەوی دەشمان زانی لە بیرمان چوەوە. بۆ ناڵی‌ی مامۆستا نەخۆشی یان ساغی؟!.. ئەمەی پێ ناوێ.. تۆ پێم بڵێ: ئەم بەینە لە کوێ بووی؟!.بیستوومە ببویە پێشمەرگە!.. باوکم ببوورە.. من کە باسی هێندێك پێشمەرگەم کرد، نیازم لە تۆ نەبوو. من ناڵێم، حاڵی‌ی عەرزم بووی، پێشمەرگە درێغی‌یان کردوە.. قەدریان لە سەر سەرم. بەڵام من دەڵێم پێشمەرگە خاوەنی ناوێکی بەرزو پیرۆزە. بە نیازی، حاڵی‌ی عەرزم بووی، ئازادی ئەو گەلە لی‌قەوماوەی گیانی خۆی لە سەر بەری دەست داناوە.. حەیفە، حاڵی‌ی عەرزم بووی، کاری وا بکا خەڵکی گلەیی لێ بکەن. ناوێرم دەنگ بکەم.. بەڵام بۆ خۆشت دەی‌زانی، هێندێکی واتان هەیە هیچ ئەو ناوەی لێ ناوەشێتەوە.. یەکێکتان لێ دەناسم چەند ساڵ، حاڵی‌ی عەرزم بووی، لای خۆی خوێندوویە. چەند رۆژێك لەو سەرە ماوەتەوەو ئێستا هاتۆتەوە. بە سەری تۆ نا بە سەری خۆم، جوابی سلاووم ناسێنێتەوە. قەت باوەڕ ناکەم، حاڵی‌ی عەرزم بووی، فیرعەونیش ئەم فیزو لە خۆبایی‌بوونەی بوو بێت. من دەڵێم ئەمە باش نی‌یە.. ئێمە هەمووومان کوڕی ئەم ئاوو خاکەین. لەسەرمانە خزمەت بە فەقیرو بی‌دەسەلاتان بکەین.. خۆفش کردنەوەو کەشخەلی‌دان، حاڵی‌ی عەرزم بووی، بۆ پێشمەرگە شتێکی جوان نی‌یە.. تۆش لات وانی‌یە؟. ئەوسا کە ئێە پێشمەرگە بووین، خۆت دەی‌زانی چۆن خۆمان بە خزمەتکاری گەل دەزانی.. لە جیاتی ئەوە خانوو بۆ خۆمان بکەین، قۆڵمان هەڵ کرد بوو خانوومان بۆ بێوەژن‌و هەتیوان دەکرد.

ئەرێ باسی چم دەکرد.. ها.. جا ئەوانە بە ئێمە دەڵێن: چیتان کردوە؟.. بۆ نەهاتن بۆ چیا؟.. باوکم چۆن بێم؟.. کۆشێك ماڵی رەش‌و رووتم، حاڵی‌ی عەرزم بووی، بە ریشەوە بوە.. گوشت گرانە.. پیواز، کووتاڵ پەڕیوەتە پشتی شێران. تەماتە.. تەماتەی سەگباب، حاڵی‌ی عەرزم بووی، هەر باسی نەکەین باشترە. ئیجار، لیمۆن دۆزی، سابوون، هەرچی دەستی بۆ دەبەی وەك مار پێتەوە دەدا.. دەبینی.. ئەو شتانەمان بۆ هەزاران کەن، ئەوسا چی بڵێن هەقتانە..

_مامۆستای بەڕێز.. من نەهاتووم باسی سیاسەت بکەین.. دەمەوێ بزانم چۆنی‌و لەوەتا تەقاعوود کراوی، هەر بە دۆمینەوە خەریکی یان ئیشێکی تریش دەکەی؟.

_ئیش.. ئیشی چی؟!.. ئەوی راست بێ، جگە لە دۆمینە، کەیفم لە خوێندنەوەی مەجەللەی کوردیش هەیە.. بەڵام، حاڵی‌ی عەرزم بووی، ئەویش بۆ من مەسرەفێکە. کەس نی‌یە بڵێ: ها بە خۆڕایی بی‌خوێنەوە. قسەی خۆشمان بێ جارجار لە دەستی خەڵکی وەر دەگرم.. بەڵام قەت نای‌کڕم!.. باوکم تۆ حیسابی کە.. هەر وردەو پردەی ماڵ.. حەمام، ئوتی، بنێشت، ئاووکارەبا، دەرزی‌و دەزووش پارەی تی‌دەچێ.. لە کوێ بێنم؟.. چیم لە خۆم زیادە تا بی‌دەم بە مەجەللە. مەسرەفی نادی‌و چاخانەم هەر لە بیر نەبوو..مانگی چوار پێنج، حاڵی‌ی عەرزم بووی، دینارم هەر لەوانە دەڕوا.. تۆ دێیتە لام ساردی‌یەك، ئەم دێ چایەك‌و وێرێك، حاڵی‌ی عەرزم بووی، بۆ فلان‌و دەعوەتێك بۆ فیسار.. ئیتر تاقە چل دینار لەم رۆژەدا بەشی چم دەکا؟!. ئێستا دەزانم لە دڵی خۆتا دەڵی‌ی وازلەو دۆمینەیە بێنەو ئەو پارەیەی لەوێ سەرف دەکەی، بیدە بە کتێب‌و مەجەللەو بیخوێنەوە.. بە سەری من وا نی‌یە؟!.. ئەگەر وەك تۆ دەڵی‌ی حاڵی عەرزم بووی، وا بکەم.. ئەوسا وەختی بی‌کاریم بەچی رابوێرم؟.. حاڵی‌ی عەرزم بووی؟!...

_بەڵێ مامۆستا گیان حاڵی‌ی عەرزت بووم.. بەڵام تۆ رێگەت نەدام کە حاڵی‌ی عەرزم ببی.. خوا حەفیز.

## پەراوێز

*ئەم نووسینەی هەژار لەلاپەڕە (29_35)ی ژمارە 3ی ساڵی 1ی گۆڤاری نووسەری کورد لە ئابی 1971دا بڵاوکراوەتەوە.



بەناوی خودا

# چی لە یەزیدی دەزانم؟

### پێشەکێکی هەژارانە

ئەگەر دەڵێن کورد ئازایەو بەفەرمودەی حاجی قادر "گوردی شانامە پاکی هەر کوردە، کافی ئەم صافە گافی ئەو دوردە"؟ بەڵێ ڕاستە کورد ئازایە، چاو نەترسە، هەرمە پرسە، چەندە عەگیدو، وێرایە، لە کوشتنی داگیرکەرو، دەست درێژکەران خێرایە: ئەگەر مێژوی کە ونو، تازەی، ئەو میللەتە، لێقەوماوەو، لانەوازە سەرفیرازە، شیکەینەوەو، بەوردی لێکی دەینەوەو، لەهەر خەلوارەی لاوێچێك بۆ نمونە بێنینەوە، کتێبێك وەك تەوراتی لێ چێ دەبێ. بەڵام ئاخۆ ئەو گەلە بەدەستو بردە، ئەو پاڵەوانە بەگوردە، بۆچی هەربن دەستە ماوەو، تائێستا چی بۆ نەکراوە؟....

چونکە مانای ئازایەتی ڕاستەقینەی نەزانیوە. وای زانیوە: ئازایەتی خرۆپری لە شیرو خەنجەرە وە شینی کەوان کێشیو، تیرهاوێژیو، دەسرێژو، سەنگر گرتنا، کۆبۆتەوە.

داخەکەم. هێندە نەگەیوە کە تێبگا. پتەوی زەندو مەچەكو، دەگزراچون بەدەستو چەك، تەرزێکی زۆر باریکۆکەی، داری کوتەرە ئەستوری پڕ لقو پۆپی هەراوی، سەردە راوی ئازایەتیو ئازادییە. کەئەم دارەش ناونراوە فەرهەنگو لە ناونەدانی سامانی نەتەوایەتی.. سامانی نەتەوایەتی، تاریخە وێژەو ئەدەبە سەر بهوردو سەگوروشتەو داستانە، بەندو باوی ناو کۆمەڵە. پەندی رندی پێشینانە گەشەکردنی زمانە. زمان پیناسی گەلانە، تاریخ رەگی داری ژیانە، هەزاران لكو پۆپی هەن کە یەکێکیان، چاونەترسانە، لە جەنگا، هەر گەلێك فەرهەنگی نەبێ گەلانی تر، نەرەنگ بۆرو، نەرەشتاڵەو نەقولە زەنگی نایناسنو، هەر ناشیانەوێ بیناسن هەتا گەلانیش نەیناسن هەرچەند خۆڵەدارو بەرددا، ناگاتە هەواری هەرمان. دەبێ هەر تەم تەم بکێڵێو هێڵی ناگاتە سەر نەرمانو خەرمانی ئازادی، ربە ناپێوێ.

زۆر مخابن کورد ئەوەندە لە مەیدانی جەنگ ئازایە ئەوندەو بگرە دەئەوەند، لە نوسینو، نەخوازە نوسین لەمەڕ خۆی بێکارەو دەستەوستانە. دیسان زۆر جێگەی سوپاسە کە جاروبار تاكو تەرا پیاوانی وان لێهەڵکەوتون، سامانی نەتەوایەتیان بۆ پارازتۆینو، ئەگەر پیاوانی رابردوی وەك جزیریو خانیو، وەك شەرەفخانی بدلیسیو، کەسانی تر نەبونایە.

ئێستا هەر تون بەتون دەچۆین. کە یەك لەو دڵسۆز بەکوردە مەلایەکی بایەزیدی بەناو مەلا مەحمودی دبۆە مەلا مەحمود جگە لە وەرگێڕانەوەی، شەرەفنامە بەکرمانجی- کە داخە کەم چاپ نەکراوەو دەس ناکەوێ خدەو نەریتی کوردانەی زەمانەی خۆی گردەوە کۆئی کردۆەو، لە سایەی مامۆستا ژابای کونسولی روس لە تورکیای ئەو رۆژگارە پارێزراوەو نەفەوتاوە.

ئەوا کاك عەزیز داشبەندی کە لاوێکی زۆر ژێهاتیو، زۆر دڵسۆزە، بەفارسی وەریگێڕاوەو، زۆر پەراوێزی لێناوەو، زۆر بەپوختو پاراوی نیشانی داوین. بەهومێدم هەروەك من زۆر کەیفم گرتی، لای لاوانی کۆرە کوردی فارسی زانیش، واپەسەند بێ، خوایاری هەولامان بێ، هەژار. کەرەج- 1981م

برای بەرێم کاك عەزیز محەمەد پور داشبەندی ئەم کتێبەی دامێ تەماشای کەمو زۆری لێ نام کە دەربارەی یەزیدیانەوە ئەگەر شتێکم هەیە بینوسم. جامن دەربارەی یەزیدی چەند کتێبێکم خوێندۆتەوە کە بەعەرەبی نوسراون خوا لێخۆشبو ئەمیر جەلادەت عالی بەدرخانیش لە گۆڤاری هاواردا چەند مەبەستێکی خستیوە رو بەڵام بۆ خۆی بەمنی گوت:

کابرایەکی یەزیدیم شەش مانگ بەخێوکرد کە مەعلوماتێکی باشە لێوەربگرم.

لەدوایە بۆم دەرکەوت دەستی بریوەو هەرچی بۆی گوتوم درۆی لەگەڵ کردوم. ئێستا منیش دەڵێم ئەوەك مێژونوسەکانی تریش بەدەردی ئەمیر جەلادەت عالی بەدرخان چوبن و دەستیان بەزاخاودا چوبێ ناچارم هەر ئەوەندەی کە خۆم دیتومەو بیستومە بیگێڕمەوەو بیربڕوای خۆم کەلەو دیتن و بیستانەمەوە هەڵکراندوە دەربڕم.

بەهاری ساڵی 1952 پۆلیس لە بەغدا ڕاوی نام و رام کردە سوریەو لە کوردستانی سوریە گوندێك بەناوی قبور البیض گیرسامەوەو، لەلایان ماڵە حاجۆ ئاغاوە پەنادرام و، ماوەی سێ ساڵێك لەوێ ژیام. خەڵکی گوندەکە کە سێصەد ماڵێك دەبون تێکەڵاوێك بون لە: موسوڵمان و فەلەو یەزیدی و بۆ خۆیی چێشتیش جولەکەیەکیشی لێبو. هەمو پیاوەکانی گوند هەمو شەو لە دیوەخانی ئاغا کۆدەبونەوە. هیچ گانەم دە بیبست کێشەی ئاینی هەڵگیرسی "یان کەس تاریفی دینی خۆی بکا" "نەوەك غەیرە دینەکە دەدەڵی بگرێ کە من ئەم ئاکارەم زۆر، وەبەردل کەوتبو.

ڕۆژێکیان لە ناو بازاری گوند کوردێکی موسڵمان کە دیار بو تۆرە کرا بو بە کوردێکی یەزیدی گوت: برو هەی نەحلەت لە شەیتان. یەزیدی نەیوێرا جوابی بداتەوە... من بانگی کابرای جوێندەرم کرد و گوتم: کاکە ئەو یەزیدیە کوردە"هاو ماڵتە" وەك براتە. پێم خۆش نەبو دڵت ئێشاندز کابرا شەرمێك گرتی و چو بە لای یەزیدیەکەوە و گوتی بیکە بە خاتری هەژار، بم بەخشە ئیتر تو بە خەڵەتی وا ناکەم.

دوای چند ڕۆژێك دیتم شێخێکی یەزیدی بە چەند مریدێکەوە هاتە ماڵم و بەزۆر دەستیان ماچ کردم و هێندێکیش دیاری لادێیانەیان بۆ هێنابوم... شێخ گوتی تۆ خۆشەویستی ئێمەی. تۆ نەت هێشتوە موسوڵمان خەڵەت بکا...

ئیتر لەوساوە دەگەڵ یەزیدیەکانی هاوماڵ و چەند ماڵە یەزێدیەکی کە لە گوندەکانی دەوروبەربون تەواو بومە ئاشنا تەنانەت بۆ ئەو جێژنانەی کەنابێ نامۆیان دەناودابێ منیان بانگ دەکردو بەخۆشیەوە رامان دەبوارد.

ئەوەندەی دەماوی ئەم سێ ساڵەدا لێم حاڵی بو: کاهو ناخۆن. چونکە لەکتێبەکانی ئەفسانەیی دینی خۆشمان دا دەڵێ: ئەگەر شەیتان دەرکرایە سەرزەوی خۆی لەبن چڵە کاهودا شاردەوەو کاهو راستی لێ گوت. حەز ناکەن کەسی لای ئەوان تف فرێدا چونکە لایان وایە تف لە شەیتان دەکەن کە خۆشیان تف ناوێژن. لە ئافتاوەو لولینە تۆرەن. نازانم بۆچی؟ بەڵام چای لەکەی تریدا، دەخۆنەوە کە ئەویش لولەی هەیە. لەو وشە کوردیانە خۆ دەپارێزن کەشە –یان، طای تێدابێ. لەجیاتی شەمطێن کە بەخلیسکان دەڵێن وشەی چەرخین بەکاردێنن... ئەگەر بوێرن دەنگ بکەن موسوڵمانیان لە هەمو شت پێ خراپترە. کاك زەبیحی دەیگوت ڕۆژێك: (عەمەری خیلتگی) کە یەزیدیەکی دۆستم بو "گوتی هەردوشت لەدنیا پیسە یەك موسوڵمان و ئەویتر قەرزداری.)

تاوس پیرۆزە... دەڵێن هەیکەلە تاوسێك لەمس دروستکراوەو لەماڵە میری گەورەیە. پایزان کەداهات کۆکراوەتەوە. پیاوە گەورەکانی ئاینی، تاوس لەمیر بەکرێ دەگرن و دەربەست پولێکی دەدەنێ. ئەوانیش دەناو قەو والاندا کە لە چینی خوارەوەی پیاوی آینیدا قەراریان گرتوە دەی خەنە هەر ڕاجەوە. کێ زۆرتری دابو بردیەوە ئەو ساڵە ئەو تاوس دەگێڕێ.

قەووال بەتاوسی مسینەوە بەدێهات دادەگەرێ. بەرەو هەر گوندێك دەچێ. خەڵکی ئاوایی. ژن و پیاو بە پیریەوە دەچن و لەماوەیەکی دور لە دێ دا دەیگەنێ... دەبێتە دەمەقاڵە کە کێ تاوس تا گوند هەڵگرێ.

قەوال کە دەپێشدا خەبەرو باسی هەموشتێکی هەیە. جەواڵێ تاوسی تێدا دەخاتە سەر ملی دەوڵەمەندترو سەخی تریان. شەو لە دیوەخانی گوند کۆدەبنەوە.

قەوال روی تاوسی کردو تەخۆی. دەپرسێ: فلانکەس تۆ چەند ئەدەی؟ ئەگەر کەم بڵێ "دەڵێ: تاوس ڕوت تێ ناکا دەبێ زیادی کەی... تابەم جۆرە، بەروتێکردنی تاوس بەختەوەریان دەکا... ژن و منداڵ هەر بەدیتنی تاوس لەدورەوە جێژنیان پێوە دەنوسێ... هەر ساڵە میرو بابە شێخ و فەقیرو قەووال لەم تاوس گەڕانە پولێکی زۆریان دەس دەکەوێ. با ئەوەشمان لە بیر نەچێ کە هەر لەچیرۆکی دینی خۆشمان دا تاوس و مار لە فریودانی دایکەوا، دا یاریدەی شەیتانیان داوەو ئەویش بابا دەمی، لەبەهەشتا هەڵناوەگەنم بخو. یان بەریوایەتی خاچ پەرستان سێو بدزێ و لەبەهەشتیان وەدەرنێن.

یەزیدی سێ ڕۆژ بەڕۆژو، دەبن. حیکایەتیش وەك بۆیان گێڕاوەوە ئەمەیە: خودا، محەمەدو مەلەك تاوسی بانگ کرد بوە لای خۆی. گوتی سێ ڕۆژوم بۆ داناون. محەمەد چونك عەرەبەو عەرەبیش زۆر بەتەماحن وای زانی داخو چیە. گوتی بەڵێ باشە سی ڕۆژمان قبوڵە. بەڵام مەلەك تاوس تێگەیشتبو کە خودا گوتویە سێ نەیگوتوە سی. دەشیزانی ڕۆژو بێکارێکی گرانە سێ ڕۆژوەکەی وەرگرت.

یەزیدی چوار تایەفەن: پیر "میر" شێخ "فەقیر" –ئەگەر گوتمان میر نیازمان لەماڵە میری گەورە نیە ویدەچێ ئەوانە کونە خزمی رەش و ڕوتیان. بن ژنی هیچ یەك لەو تایەفانە بە پیاوی تایەفەی تر ناشێ.

هەر کەسە کە ژن دێنێ ناچار دەبێ لەتایەفەی خۆی بێنێ. کە ئەمەش بۆتە بارێکی زۆر دژوار. پیو زورەو، ژن کەم. پیاوی دەوڵەمەند دەتوانێ چەند ژنێکی هەبێ. لەو ناوەدا شیر بایی ژنان کەپێی دەڵێن قەلەن ئەوەندە زۆرە کە بۆ کەم کەسیان هەڵدەسورێ... چاری ناچار کراوە بەچەند پشکێك کابرای ژن خواز ئەوی بۆی هەڵدەسورێ دەیداو ئەشێ هەر ساڵە پیشکێك لەو قەلەنە بدا. پیاوی وات لەجیزیری دەدیم کەرێشی سپی بوە هێشتا قەرزی قەلەنی دایکی تەواو نەداوەتەوە.

تەنانەت لەم دوادواییانەدا. قۆرتێکی زۆر نەگبەت ڕوی‌دا. تایەفەی پیر پیاویا چەند ئەوەندەی ژنان بون. خەریك بون وەك ماموت‌و دایناسۆر بەتەواوی مەحف ببنەوە. پیاوانی ئاینی کۆبونەوەو بۆ چاری ئەم گرێ کوێرەیە کەوتنە چارە دیتنەوە... بۆ یەکەم جار شنگڵیان لە خۆیان داو فتوایەکیان دەرکرد کە تایەفەی پیر حەقیان هەبێ ژن لەتایەفەی تر بخوازن.

سەیری خۆش لێرەدا ئەمەیە... ئەم قەلەن‌و شیر باییە زۆرە، لەناو کوردەکانی ئەرمەنستان‌و گورجستانیشدا کە یەزیدین هەر ماوەو حوکمی کمونیستی بۆی نەکراوە لەناوی ببا... (کۆلۆسی شەرۆ) کە لەموسکو دەژی‌و کاربەدەستێکە. بەو بارەوە بۆ گێڕامەوە کە لاوێکی روس کچێکی کوردی یەزیدی خواست. باوکی کچ سێ هەزار ڕۆبڵی شیر بایی لێ ساند. کۆلۆس دەیگوت. کیژەکانمان قبوڵ ناکەن قەلەنیان وەرنەگرین چونکە لایان وایە بێ قیمەت دەبن‌و دەبنە گەپ جاڕی دەستە خوشکانیان.

ئارەق خواردنەوەیان زۆر لەناو دابەوە تەنانەت پیاوانی دینیش دەخۆنەوە "زۆر بەناموسن‌و من ئەم چەند ساڵە هەرگیز نەم بیست بڵێن پیاوێکی یەزیدی بەسەر ژنێکەوە گیراوە" دیارە ئەگەر ئەمەش ڕوبدا سزا کوشتنە. ناویان زۆرتر ناوی موسوڵمانانەیە. عەلی "عەزیز" عومەر" عوثمان "زیندین" فەخرەدین‌و ئەو شتانە. تەنیا ناوی محمدو حوسینیان نیە.

لەساڵی 1958دا هاتمەوە عێراق‌و لە دۆستانی یەزیدیم دور کەوتمەوە. لەساڵی 1943دا سەرۆك بارزانی لەبارزانەوە ناردمیە لای دهۆك کە بە هێندیك کاروباری پێش مەرگەی ئەو ناوە. ڕابگرم. ڕۆژێك لە ڕۆژانی هاوین، ژەنەڕاڵ عبدالرحمن قاضی کە فرماندەی پێشمەرگە بو، گوتی دەچمە لالەش سەری پێشمەرگە دەدەم. کێ لەگەڵما دێت؟؟

جگە لەمن: ڕەشاد بالاتەو ناچی بالاتەو حافظ مصطفی قازی کەدوانیان مهندس‌و یەکیان دکتری ئەزمونگە (لابراتۆر)بو. دەگەڵ کەوتین. کە بچینە دیداری پەرسگای گەورەی یەزیدیان.

لەو لەقەبو ناوانە هەیبەت نەگرێ. هەر پێنج مان جل شڕو، بەتیتاڵ‌و پێڵاو،، خێچ‌و خوارو، زۆر نالەبار بوین. نەخوازا من لە هەمویان شڕوشوڵ تر بوم. پێلاوی پێم، لاستیکی تایەی ترومبێل بو. کەسەرەکەی بەبەن چندرابو کە بەشێوەی کرمانجی شەکاڵی ناوە. شەکاڵەکەم ئەوەندە چەك‌و کەچ بو نیوەی پاژنەو هەمو سەر پەنجەم هەر لەسەر زەوی بو.

ڕێگەکەشمان بزنەرشێ‌یەکی کوێرەوە بوی پڕ لەدڕوە زەردە بو "لەزۆر شاخ و، بەندەنی چڕو دڕو پڕ لەهەورازو هەڵدێرو سەرەوژورو، بەرەو ژێر سەرکەوتین‌و، داکەوتین. تاگەینە گۆرایی" هێزو پێزێکمان نەمابو. گەڵیەکمان لێ دیار کەوت چی ببینم؟: دۆڵ‌و دەرەیەکی سەرتاپا سەوز "لەسێ لاوە چیای پڕدار دەوری داوە چونکە شوێنیکی پیرۆزە هیچ کەس نەوێراوە دارێکی لێ لار کاتەوە. بەڕاستی بەهەشتێکم هاتە بەرچاو. لەمەولا ڕێگە تەخت‌و نرمان بو گەیشتینە ئاوێك کە پردێکی بەسمان دارڕاوی لەسەر کرابو، تاوێك لەسەر ئاو ساینەوە. شەکاڵە بۆرم داکەند لاق‌و لەتەرم لەزامارێ زۆر شپرزە ببو.

بڕبارم دا بەپێخواسی بچمە ئاوایی "چواری بەپێلاوو یەکی پێخواسی شەکاڵ دەبن باخەڵدان ڕو بەئاوایی بزوتین. زۆری مابو بگەینە دێ. کۆمەڵێك لە پیاوانی ئایین‌و بۆرە پیاو، پێشوانزیمن هاتبون.

چاوە نوڕ بوم کەمنی پاپەتی‌و، لە هەموان بێ نمودتر لەدوای هەموانەوە بەخێراتن بکرێم. بەلام تەواو پێچەوانە دەرچو. بەر لە هەرشت گشت لەگشتیان غاریان دامێ‌و دەست‌و شانیان ماچ کردم‌و خستیانمە پێشە خۆیان‌و ئەوسا سەرزارەکی بەخێراتنی جەنەڕاڵ‌و هاوالانی ترین کردو، ڕویان لێ نان کە لەخزمەت جەنابی من دا تەشریف بەرنەئۆدی میوانان. ڕوی قسە هەردە من بو قوربان‌و ئەزبەنێ کەری نێرنەی دەکێشا جگەرە لەسەر جگەرەبو من داویژ ڕاوچادە پێشدا لەپێش من دادەنرا. ئێمەی میوان کەسەیر ماوین بەزمانی چاو، لێك دەپرسین خەبەر چیە؟ خۆشم سەرم سوڕماوە کەسیان نامناسێ. تەرح‌و بیچم‌و جل‌و بەرگیشم، حورمەت هەڵناگرێ جەنەرال دەناسن‌و لێشی دەترس سیر چیە؟ لەو ناوەدا بەمنیانەوە گرتوە! وەختێ فراوین، هات سفرە ڕاخرا. هێتا خواردنی نەهاتبوە سەر. یەکێك هاتە ژورو ڕوی تێ کردم: بابێ چاوێش عەمردەکا تۆ بچی دەگەڵ خۆی نان بخۆی...

**بابێ چاوێش چیە؟!**

زاهیدێکی تەرکە دنیایەو جلکی سەرتاپا سپی‌یەو ڕیش‌و پرشی تێکەڵ بوە وە باڵ بە ئەستۆی ئەوانەی لێم بیستون سیرەتی خۆی هەر بەچەقۆ لە بن داخشت کردوە، تاتەمای گوناە بەربەست بکا لە سیەی نێرایەتی لەدەست دانی، سێ ژنی خواپەرستی تەرکە دنیا لە تەکیەدا خزمەتی دەکەن‌و ئەوانەش هەرچواریان وەك چوار خوشك لەژورێکدا پێکەوە دەخەون.

بابێ چاوێ زۆر بەڕوی خۆشەوە بەخێری هێنام‌و پێکەوە پلاوساوارێکی زۆر نازدارامان -بێ- ئێوە ناخۆش نۆشی گیان کرد.

سەر لە ئێوارە فەقیر شەمۆکە پلەیەك لەژێر بابێ چاوێشدایەو سەرتاپای جلکی ڕەشەو بەهەمەکارە حیسابە زیاد لە هەواڵەکانم خولقی کردم کە پێکەوە گەشتێك بکەین. چوینە قەدێ چیای پشت مالان کە دەیڕوانیە هەمو گەلێیەکە. چوارمێردەکی دانیشتین‌و پا تۆزێك سانەوەو سەبیل کێشان فەقیر شەمۆ هاتە دەنگ‌و فەرموی.

هەژار تۆ پیاوێکی زۆر باشی‌و لە خۆمانی دەبێ. هەمو ئێزەدی تۆیان خۆش بوێ. ئەم بەیانیە کە ئێوە دەهاتن ئێمە چومان لێتانەوە بو، هەر کە گە -یشتنە سەر (پراسلاتێ)- پردی سیراتێ- تەنیا تۆ پێلاوت داکەندو بە پێخواسی هاتی. هەوالانت کە ئیزەدی نین پێلاو دەپێ هاتنە

ئاوایی کە ئەم کارە بۆ میری گەورە نەبێ بۆ کەس دروست نیە.

تازە بۆم دەرکەوت کە موعجیزە لەبن سەری پێڵاوە شڕەکانم دابوەو. من ناشکوریم پێ دەکردن... بەسەرکزیەکی شەرمیو نانەوە گوتم.

لەوساوە کە لەدیوانی شێخ ئەحمەدی جزیریدا توشی ئەو ناوە بوم کە فەرمویە:

دلێ گەشتە مەژ دێرێ- ناچم کەنشتەیێ قەت
صیحرابی وی بمن ڕا- وەرە دا بچینە لالەش

ئەو شیعرە هی شێخ ئەحمەدی جزیری نیە شیعری شێخ ئۆ بەکری جزیرێیەکە یەزیدەکی مەزن بو. بەڵێ دەبێ فەرمایشتی تۆ ڕاست بێ و من بەهەڵەدا چوبم ناوی ئەحمدو ئۆبەکر لێك گۆڕابن. عەرزم کردی من لالەشم خۆشویستوە... لەجزیرەش زەمانێك دەگەڵ یەزیدیان دۆست بوم. بەڵام ئەوی ڕاست بێ. لەڕێ و شوێن و ئاین زۆر بێ ئاگام. دەتوانم هێندێك پرسیاران بکەم؟؟

—خودێم زانیبو تەئەوی دبیژ کابیژە. ئەزی هەر تشتەکی ژتە رابیژم.

—دەمزانی پیاو دەبێ لەسەر پردی سیراتێوە خۆی پێخواس کا. بەڵام نەم– زانیوە حیکمەتەکەی چییە؟

—ها بوتە بیژم. مرویەك هەبو ناوی موسا بو. دەگەل بینا هی چاوان ئاخافتن دکرد. تەئەقی ناس دکی؟

—بەڵێ زۆر باشی دەناسم. یاخوا بەرەحمەت بی. کوا پیاوی وا هەڵ دەکەوێتەوە دەی فەرمو:

—جارێك ئەو موسایە لە بیناهە چاونی پرسی: خودێ وو– چەند سال عەمری تەمایە؟...

**خوافەرموی:**

—من عەمری خۆمن پێ نالێم بەڵام ئەگەر بگەیە گەلی لالەش لەوێ دەروێشێك هەیە نوی شێخ هادییە لەو پرسە. پێت دەڵێ من چەندم عەمر ماوە هەر ئەو دەیزانێ و کەسی تر.

موسا کاڵەو پێتاوی دابەست و خورجنێکی پڕ لە تێشوی سەفەر بەسەر شانەوە هاتە کوردستان و بەپرسیاران گەلی لالەشی پەیدا کرد.

هەر گەیشتە سەر ئەو پردە ئاگردە خورجەکەی هەڵگراو هەرچی کردی بۆی دانەمرا. هاواری لە خودا کرد: ئەم گرەت بوبەردایە خورجەکەم. ئێستا چیبکەم؟ خودا فەرموی (خەلع حیزا).

—تۆ نازانی بەعارەبی (خەلع حیزا) یانی چی؟ —نەخێر ئەزبەنی عارەبی نازانم. ها. یانی شەکاڵی خۆ پاوێژە. موس گورجێك خۆی پێخواس کرد و پێڵاوی تۆر هەڵدان و ئاگری خورج دامرکا. وا لەوساوە هەمو کەس دەبێ لەسەر ئەو پردەوە بەپێخواسی بێت. تێ گەیشتی؟ —بەڵێ ئێستا لەو بارەوە خەشم لەدڵ دا نەما. زۆربە دڵ حەزم دەکرد بمزانیبا خواچەند ساڵی تر عومر دەکا. بەڵام فەقیر شەموچی تری لەسەر نەڕۆیشت و منیش نەم. وێر لێی پرسم موسا و شێخ هادی چیان کرد. دەترسام ماشەری فەرمایشتکەی لێ ئالۆز بێت گوتم با قسەی خۆی بکا– توا زانیوتە حەجی بسڵمانان چۆنە؟ —بیستومە: دەچنە مەکە، جلکەکانیان دادەکەنن، دو فوتەی بێ تەقەڵ دەخویانەوە دەپێچن، ورکە بەردان دەشتێکی نادیاری دەکەن، بەگورگە لۆقان غاردەدەن، لەئاکاما سەروحەیوان سەردەبڕن و، سەریان بەگوێزان دەتاشن و بەپەڕۆیەکی زەرد دەیبەستن و بەرەو ماڵی دەبنەوەو دەبێ پێیان بێژن حاجی.

بەڵێ وەگ بیستوتە وایە بەڕاستی پیاو بەزەی بەو هەژانەدا دێتەوە لەو گرمایە خۆ ڕوت دەکەنەوە. بەناو تەپ و تۆزی لمی عەرەبستاندا گرێوی غار دەکەن، زۆربەیان توشی تەنگەنەفەسی و بەرهەنگ دەبن. دەسابا منیش باسی حەجی خۆمانت بۆ بکەم.

ئێمەش هەر لەڕۆژانی جێژنی قوربانی بسڵمانان دا حەج دەکەین. بەڵام چۆن حەجێك؟ ژن و پیاو کیژو لاومان خۆ دخەملێنن، سێ شەو لەسەریەك تا شەو گار شەق دەبێ لەسەر چیای عورفاتی بەدەنگی شەباب (شمشاڵ)؟ دەرەقسن و لەوە بەولا، هەمولایەك بەخۆشی بەرەو ماڵ دبنەوەو دەسێنەوە. من ناڵێم. خۆت بڵێ حەجی ئێمە ڕەحەت ترە یان حەجی ئەوان؟

بێ قەزابی جا ئەوەش پرسیاری دەوێ؟ شەو داوەتی ڕەش بەڵەك بەدەنگی شەباب و مل ملانی دگەل غاردانی بەرگەرمایەو تۆزو غومار خواردن چون دەبنە یەك؟ ئەویش نەخوازا بۆ لاوێکی دڵتەڕی وەکی خۆم؟

بەڵام لەناو فەرمایشتەکەت دا گوێم لەنوی چیای عورافات بو. دەڵێن لەحەجی موسوڵمانانیشدا چیای عەرەفات هەیە. وێناچێ ئەم دوناوە دورە خزمایەتیەکیان پێکەوە هەبێ؟

نە چیای عورفاتی ئێمە تشتەکی جیاوازە. ئەم سێ زنجیرە چیایەی دەوری گەلی لالەشی داوە بەناوی مەشەت، عورفات، عەزرەت، ناو دەبرێن. هۆی ئەم ناوانەش ئاوهایە:

ساڵێکی لەزەمانی شێخ هادی دا شێخ عبدالقادری گەیلانی، شێخ جونەیدی بەغدادی، شێخ شبلی و، چەند شێخێکی تر لەبەغداوە بڕیاریاندا بێنە شەڕی شێخ هادی. شێخ هادی بە کەڕامەت دەیزانی لەکوێوە دێن. یەزیدیەکی سواری گاشە بەردێك کرد. گاشە بەگرمەو ناڵەو چوارناڵە خەبەی دانێ کەلەوێ چاوەنۆڕبن. شێخ هادی بۆ خۆی دێتە لایان.

شێخ هادی سواری شێرێك بو، مارێکی زەلامی کردە قامچی، دودوپشکی کردنە ئاوزەنگی، گەیشتە میوانان. لەپەنا تیشە شاخێك لەدەوری یەکدانیشتن، دەس کرا بەباس و خواس، شێخ عبدالقادر داوای ئاوی کرد. گەڕان ئاو نەبو، گوتی زۆرم تونیە. نەمان کرد ئەو کاتە کە دەهاتین بۆ ئێرە هێندێك ئاو دەگەڵ خۆمان بێنین. شێخ هادی گۆپاڵی لەشاخە بەردەکەدا شەقە جۆگەیەك ئوی ساردو سوك، لە کەلێنە شاخەوە لوزەوی بەست، تەزبیحێك و دارعەصایەکش بەئاوەکەدا هات. شێخ عبدالقادر گوتی. ئای، ئای، خودێ ئەف تەزبێ و عاسایەم بون م ژبیرا کربوە بخورا، بینم.

ئیتر گشتین شاتەیان بەشێخ هادی هێناو گوتیان ئەشەتو، ئەتۆ مەزنی حەمێ شێخانی چیا کە، لەو ڕۆژەوە ناوی مەشەتی پێ براوە.

ئەمجار لەسەر بانگهێشتی شێخ هادی هاتنە سەر چیای بەرانبەر بە مەشەت و ماوەیەك مانەوە یەكتریان زۆر باش ناسی. بەعارەبی عوروف، عوروفات هەڤدو ناسینە، بەو هۆیەوە ئەم چیایە ناوی عوروفاتی لێ نراوە، ئینجا چما. چیای عەزرەتی تا بۆتە بێژم:

مەلا ئۆبەكری جزیری كە تۆ بەهەڵە لات وابو شێخ ئەحمەدە. گەلێك بەئاواتەوە بو زیارەتا شێخ هادی بكا، بەو هومێدەوە بەرەو لالەش وەڕێ كەوت. گەیشتنە سەر ئەو چیایەو، لالەشی دەركەوت و پێمەێردی خودای لێ پەیدا بو، ڕۆحی كێشا. بەعەزرەی دیداری شێخ هادیەوە مرد. بۆیە ەو كەژەش عەزرەتی ناوە. -ئەزبەنێ فەرموت شێخ هادی دوپشكی كردبونە ئاوزەنگی ئەگەر جارێك پێی توند لێ داگرتبان نەدەپسان؟ نە: دوپشكی گەلەك مەزن بون. ئەزبەنێ وەختی بەسەر پرا سلاتی دادەبوریم، چەند كەڵەك و حەشارەگەی بەردینم دیتن كە لەلێواری پرد هەڵچنرابون، ئەوانە چین؟ -بەپێكەنینەوە ئەوانە كاریان بەسەر ئاینەوە نیە. ئەم گەڵیە سیخوڕی زۆرە. سیخوڕیش خۆت دەزانی قەستەسەری گندۆرانە. خورتی ئێمە ئەو حەشارانەیان كردۆتەوە، شەونە خۆی تێدا مات دەدەن، ڕاوە سیخوڕدەكەن. -ئاوادە بی پردی سیرات. ماشینی بەسەردا دەڕوات، شوێنی ڕاوە سیخوڕیشی هەیە، بنیشی ئەو ئاوە خۆشەیە. پردی سیراتی موسوڵمانان- یاخوا هەرگیز ڕێی تێ نەكەوێ وەك دەڵێن: لەمو باریكترە، لەئەڵماس تیژترەو ڕێگەی صد ساڵی پیادەی قۆچانە. بەڵێ بەڵێ بیستومە.. دەهەر تۆ بیری لێ بكەوە. كێ دكاری لەموی واتیژ بپەڕێتەوەو صەد ساڵیش هەر بەڕێوە بێ. ئاخر نانێك، ئاوێك، تاوێك سانەوەی ناوێ؟ خودێ تشتەكە عەجیبە. -تشتەكە دن مایە بپرسی؟

چەند قسن و مەرقەدم لێوە دیارن ئەوانە هی كێن؟ -تەسبێ زیارەتاوان تكی. یەك شێخ شەمەكە بسڵمان پێی دەڵێن شەمسی تەبریزی. یەكیان گۆڕی مەلا ئۆبەكری جزیریەو یەكیش مەقامێ بارزانە. -وەك دەفەرموی دەبێ یەك لەمشایخانی بارزان لێرە نێژرابێ؟

**نازانم هەر ناوەكەی وایە.**

ئێوارمان لێ درەنگ بو، وتوویژان لێرەكانیدا وەستاندو هەستاین و بەرەو ئاوایی داكشاین. سبەی ئەو ڕۆژە فەقیر شەمۆ لەپێشەوەو، ئێمە چور قۆڵی بەشوێنیەوە چوینە زیارەتی شێخ هادی لەبەردەركی دارینی مەرقەد وێنەی مارێك سەرنجی ڕاكێشام. كەمارەكە دەڵاڵەكەی بەهەشتم وەبیرهاتەوە نیوان نیوان چەند لنگە تەرازو ئاسایی بەزنجیر هەڵاوەسرابون كە گوایە جێ چرابون بە فەرمودەی فەقیر لەبارەگای. شێخ هادی دانەوت دەكار ناكرێ. ئەو جێ چرایان ڕونیان تێدایەو پڵیتەیان تێ خراوەو هەمو شەو بەدەستی خۆی ئەوانە دادەگیرسێنێ -لەحەوشە، دەرباز بوین و، لەپاش سەركەوتن لەسێ چوار پلەكان.

چاكم لەبیر نەماوە -بەدڵانۆكێكدا ڕۆیشتین. لەدەستی چەپەوە چوینە ناوژوری مەرقەد پیاو هەر زو تێ دەگا كە ئەم بارەگایە كۆنە مزگەوتەو ئێستاش شوێنەواری میحرابی هەر ماوەو تێك نەدراوە. شێخ لای قیبلەوە نێژراوە. شباكی سەر مەرقەد لە دارەو زۆرتر لە صندوقێكی گەورەی سەرەونخون، كراو دەكا. بەدەمەلاسكەی فەقیر شەمۆ هەرچور قۆڕنەی صندوقمان ماچ كرد. فەقیر تێری دوعا بۆ بارزانی كردو ئێمەش گوتمان ئامین. وەختی دەركەوتن ها، فەقیر كەلەپێشدا پێشەنگی كاروان بو ئەم جار لای گاوانیەكەی گرت و یەكی یەكی لەپێشە خۆی داد دەی نار دینەدەر. پەردەیەكی سور لەسوچی دیواری بەرانبەر دەرگا لەمیچەوە تاسەر زەوی گرتبو. ژەنەراڵ قاضی گوتی ەبا زیارەتی ئێرەش بكەین. فەقیر شەمۆ ەرموی: كارتا بەسەریەوە نەبێ، كەسێ نابێ دەستی لێ دا، مەمنوحە. من فزولی هەڵیگرتم. سوێندم لەفەقیر شەمۆ خوارد كە ئیللان و بیللان ڕێم ناكەوێ پێشی كەوم. ناچارم كرد بەر لەمن بڕواو لەو هەلەدا دەرفەتم هێنا. پەردە سورم. هەڵ داوە.. كورسیەكی ڕەق و ڕوق نەبێ چیترم نەدیت. وەباڵ بەستۆی ئەو موسوڵمانانە بۆیان گێڕاومەوە. گوا.یە لە ساڵدا شەوێك- مەلەك تاوس لەو سەر كورسیەوە لەوپشت پەردەوە دەگەڵ بابە شێخ. یان میری گەورە، دا قسە دەكا و دەستوراتی پێداویستیان پێ دەدات و بەبێ ئەوەی ببیند ڕێ غەیب دەبێ دوای ماچ كردنی بەرد و دارێكی زۆر لەدەوری ئاوی زەمزەمێ جێگەمان بۆ چاكرابو كە نیوەڕۆژ لەوێ بخۆین.. ئاوچێاو؟ باوەڕ ناكەم لە هەمو كوردستانا ئاوی ئەوەندە. سوك و ساردو شیرن هەبن.. لەدەوری دانیشتین پاڵمان دابو بە دیواری ژورێكەوە كە دەرگای گاڵە درابو دیاربو سەرچاوە لەو ژورەدا هەڵدەقوڵی. وەك بۆیان گێڕاومەوە هەر كیژو كوڕێك دەبنە دەزگیران لەڕۆژانی زیارەتی گەورەدا دەبێ بێنە ئەو شوێنەی ئێمەی لێ دانیشتبوین مەلای مارەبڕ. فەقیر شەمۆیان بابێ چاوێش بێ. بەنۆرە دو دەزگیران دەباتە ژوری سەرچاوەو مارەیان دەبڕێ و، سەری هەردوكان لەئاودا نوقم دەكا و هەریەكەی دەسروكیكیان لەسەر دەبەستێ و دەڵێ لەئێستاوە ئێوەژن و مێردن لەو زیارەتانەی كەپاش نیوەڕۆ بەنسیبان بو. دوت سەرنجیانە ڕاكێشام. یەكەم. دارتوێكی زۆر ئەستور بو. لەناوەڕاستەوە ئەوەندەی دەسی پیاوێكی دەستە بالای پێ ڕابگا وەها كروسێنرابو كە لەوانەبو بایەكی بەهێزی لێ هەڵكا. بیشكێنێ. گوتیان یەزیدیەكان كەدێنە حەج هەركەسەی بەبێ دەس لێدان هەر بە ددان تەڵەزمێك لەو دارە دەكاتەوەو بۆ پیت و بەرەكەت دەیخەنە كەندوی زمهەری ساڵەوە. وادیار بو كاهینانی مەعبەدیش بیری شكانی ئەودارەیان كردبو. حەوهەش نەمامە توی تریان لەنزیكیەوە ناشتبو كە لەدواڕۆژا ببنەجێ نشینی ئەو دایكە پیرەیان.

دوهەمیان. لەگۆڕاییەكدا هەزاران سینگولكەم دیت كە بەزەویدا كوترابون. گوتیان هەر یەزیدیەك حەجی بەنسیب ببێ و

بێتە لالەش. سینگولکەیەك لەم شوێنە دەچەقێنێ تا ڕۆژی قیامەت ئەسپی خۆی لێ وەبەستێ.

قوربانی کردنیان هەر لە ڕۆژی جێژنی قوربانی موسوڵماناندایە. نوسەری کتێب، کاك عەزیز زۆر باشی باس کردوەو کاری لەسەر من سوك کردوە. تەنیا ئەوەندەی لەبیر چوە کە گۆشتی قوربانیەکە بەکاڵی دابەش ناکرێ. ڕۆژی جەژن کە حاجیەکی زۆر کۆبۆتەوە بەدەیان مەنجەڵە ساوار کە تێری ژەمێکی هەمو میوانەکان بکا. وەسەر نراوە گۆشتی قوربانیە تاپانە کەپەل پەل دەکەن و هەر مە مەنجەڵە ساوارەی پلێکی لەو گۆشتە پیرۆزە تێ داوێژن. وەختی جەمێ هە رادەکەن: وەرنە شێوێم تێکرا، هوروژم دەکەن های لەو ئازاو بەگوردەی زو خۆی بگەیەنیەتە سررنجەڵە ساوارو پلە گۆشتێکی برفێنێ. کە نیشانەی هاتەو خەڵاتێکە لە خواوە.

لەدوای دو شەومانەوە بەهەشتی لالەشمان بەجێ هێشت و کەوتینەوە بەرجەهەندەمی تۆپ و بۆمبابارانی عارەبان.

لەم چیرۆکە هەرامەیەی کەلێم ڕونەلای زۆر کەسان زۆر بێتامە من بەخەیاڵ شتێکم لێ هەڵکڕاندوە کە دوای چەند کورتە باسێکی تر باسی دەکەم.

**شێخ هادی کێ بو؟**

شێخ هادی: شێخ عەدی کوڕی موسافیر کوڕی سمایل کوڕی موسا کوڕی مەروان کوڕی حەسەن، کوڕی مەڕوان. لەبنیچەی خەلیفەکانی ئەمەوی و لەقەبی شەرەف الدین و کونیەی ئەبوالفضایل بوە. ساڵی 647کۆچی لە گوندی بیت قار، لە مەڵبەندی بەعلەبەکی لبنان هاتۆتە دنیاوە. خوێندویەتی و بەلاوەتی شوێن زانستی ڕواڵەتی و ڕۆشن بیری عارفانەکەوتوە، ماوەیەك لە بەغدا بوە. دەگەڵ مشایخانی هاوچەرخی و بەتایبەتی دەگەڵ شێخ عبدالقادری گەیلانیدا. زۆر دۆست و ئاشنا بوەو، یەکتریان زۆر خۆش ویستوە. لەئاکامدا خوی داوەتە گۆشەگیری و روی کردوتە چیای هەکاری و لەگەلی لالەش گیرساوەتەوە، بویتە ئەشکەوت نشین و چلەکیش. دواجار کۆختەیەکی بەناوی زاویە -گۆشە. لەو گەلیە سازداوەو خەلکی بۆ خوداپەرستی و دنیا نەویستی هانداوە، مریدو پەیرەوی لی هالاون و بەناوی کۆمەلی عەدەویە ناسراون.

شیخ عەدی‌ها و بیری ئەوشیخانە بوە کە گەیشتونەتە پایەی وەحدەتی موطلەق و هەمو شتیکیان جگە لە یار لەبیر خۆ بردۆتەوە بەبیری ئەوان حەبیب واتا خوا.

هەموی هەر رەحمەت و خۆشیەو هەرگیز عەزاب و رەحمەت پیکەوە کۆنابنەوە. دەربارەی شەیتانیش لایان وابوە هیچ کاریك بەبێ ئیرادەو ویستی خودا پیك نایە. کەوابو شەیتانی مەلائیکەت ئەگەر ئیرادەی خوای لەسەر نەبوایە هەرگیز نافەرمانی بەخەیالیشا نەدەهات -کەوالو جوین دان بەشەیتان بەنارازی بون لەفەرمانبەرداریکی خوایە... (ئەم باسی شەیتان و نافەرمانیە زۆر، کتیبی لەسەر نوسراوەو زۆری دەمەقالە لەسەر کراوە کەلەم جیگە تەنگەبەرەدا ناگونجێ.)

هیندیك لەو تەرزە سۆفیانە تەنانەت سوژدە نەبردنی شەیتانیان بۆ ئادەم بەشتیکی نارەوا زانیوە. هەروەك لەچەرخی یازدەهەمی کۆچیشدا شیخ ئەحمەدی خانی لەمەم و زین دا عوزری بۆ دینیتەوەو دەلێ خوایە شەیتان هەر چونکە تەنیا تۆی ناسی و بیگانە پەرستی نەکردو جگە لە تۆ کەسی شیاوی سوژدە بۆبردن نەزانی بەودەردەت برد. سەرم لە کارو بارت دەرناچێ مەلایانی روات بین لەدریژایی میژودا بەگژ ئەو جۆرە سۆفیانەدا چون و فتوای کفریان بۆ دەرکردون و صەتانیان لی بەکوشت داون، چیرۆکی لەداردان و بەردە باران و سەرلەکۆلان هەلواسینی حوسینی کوری مەنصوری هەللاج و کوشتنی شیخی اشراق سوهرە وەردی ئیست و ئیستائی لەبیر خەلك نەچونەوە. شیخ عەدی سالی -557-ی کۆچی لەتەمەنی نەوەد سالیدا کۆچی لەدنیا کردوە (وەك کاك عەزیز دیویە تەوە ابوالبرکاتی برازای و عەدی کوری ابوالبرکات و حسن کوری عدی بەشوین یەك شوینیان گرتۆتەوە.) کەیەزیدی ئیستاناویان نازانن بەلام بەوەدا لە یەزیدی ناوی چەند پیریکیان زۆر بەلاوە پیرۆزەو سویند بە گۆری شیخ ئەبوالقاسم و شیخ شەرەف الدین کەلە چیای شەنگالن هەرگیز بەدرۆ ناخۆن وەك گوتیشمان مەرقەدی شیخ شەمس و مەلائۆبەکرو مەقامی بارزانیش زیارەتگای زۆر پیرۆزن. دیارە بەزنجیرە چەندین کەس ئەو تەریقەتەیان لەپاش شیخ عەدی بەریوە بردوەو ناوی کۆمەلی عەدەویەکراوەتە صوحبەتی‌یە. واتە دەستەی هەوالان. گەرتی هالاندن و ئاژاوەی مەلایان دژ بەو صوفیانە هەر لەگەردا بوە. کە نوسەری کتیب بەدریژی لیی دواوە.

**نەخویندەواری**

لەکوردستاندا خویندن هەر زۆر کەم بوە. ئەوەندی هەش بوە لەسایەی مەلاو مەدرەسەی فەقیوە بوە. کە یەزیدی بەتەواوی دوژمنی مەلایان بون؟ لەو تۆزە خویندەواریەش تەواو بەشیان براوە. پەیرەوانی هەر مەزەب و تەریقەتیك کە نەزان و جایل بون توشی تەعەصوبی کویرنە دەبن و پروپوچ و خراقات زۆریان دەگریتەوە.. هیچ دور نەرۆین هەر لەم زەمانەشد لەناو کوردەواری خۆماندا زۆرکەسی وا هەن کەپەیرەوی پیریکن. لایان وایە شیخ تکایان بۆ لەلای خودا دەکاو ئەگەر خۆشیان بەتاعەتەوە خەریك نەکەن هەر دەبەخشەرین. یان جگە لە کودیش زۆری وا هەن لایان وایە سالی جاریك بۆ مردویکی پیاوی خوا بگرین بەسیانەو بە هەشتیان لەسەر تاپۆ کراوە. یەزیدیش بەو دەردی نەزانیە گرتار بون و خەرافات میشکی داگرتون و لایان وابوەو لایان وایە شیخ هادی تکاکاریانەو بەهەشت بۆخۆیانە.

جا چونکە مەلایان هەر بەکوردە موسولمنەکانی هاوسایان شەریان کردون و شریان کردون و بەکافریان زانیون. ئەوانیش جگە لە خۆیان خەلکی تریان بەکافر زانیوەو

ئـــەو خەڵكـــە تـــرەش بـــەخۆیان گوتـــوە موسوڵمان. ڕقی دنیایا لە موسوڵمانەو زۆر بەشتێكی پیس و بێ فەڕی دەزانن.

بڕوایان بە خودا هەیە. شەیتانیش وەك گوتمان بەفەرمانبەردارێكی خوا دەزانن و لێی دەترسـن لاشـیان وایـە چاكـەو خراپـەی لەدەست دیت و ئەگەر دوژمنایەتی نەكەن قازانجیانە.

با ئەوەشمان لەبیر نەچێ... مەلایان كە بـەگژیان دا چـون هـەزار نـاوو نوتكـەیان بـۆ دۆزیونەتەوە بۆ نمونە شـێخ عـەدی ئـەموی بوە. هاتون بۆتانە لێدانی گوتویانە بنەچكە یەزیدەو لە سەر شوێن و ڕێـی یـەزیددەڕوا. ئەم قسەیە لـەوەندە دەوروزەمانانەدا بەسـەر زمانانــــەوە گەڕاوەكـــــە عــــــەدەوی، یـــــان صوحبەتیـــەش، لایـان گـــۆڕاوەو چونكـــە موسوڵمانیان زۆر دزاوەو بیستویانە یـەزید حوسـێن و موسـوڵمنی تـری كوشـتون بـەو لەقەمـــە ڕازی بـــون، وە لـــەناو یـــەزیدی نەسڵەمیونەوە. لەبەیتی سیامەندو خـەجێدا كەیـەزیدی دەیڵێـن. سـیامەند پاڵـەوانێكی ئەفسـانیی وەك سامسـونی تـەورات وابـوە، چوەتە یاریدەی لەشكری یەزیدو ئەگەر ئەو نـەبا، حوسـێن لـەناو نـەدەچو... تـا وای لێهاتوە كە لـەم سـاڵانەی دوایـیدا بۆیەكـەم جار لەمێژودا نـاوی یـەزیدخان و معاویـەیان لەناودا پەیدا بوە...

ئەگـــەر ئێســـتا لـــەمیری یـــەزیدی، یـــان بابەشـێخ بپرسـی ئێـوە چـین؟ نـاڵێن ئێمـە یـەزیدین. دەڵێـــن ئێمـــە ئـــیزەدین واتـــا خواپەرست. لـەو كتێبانەشـدا كـە دەربـارەی یەزیدیانەوە دیوە. هێندیك گوتویانە كونە میـــترا پەرســـتن و كۆمـــەڵێك بەكۆنـــە زەردەشـــتییان دەزانـــن و زۆر قســـــەی پێچەوانەی یەكتر نوسراون. بەڵام من لام وایە ئەو حەج و عرفات و زەمـزەم و سـواری شـێر بـون و مـاری قـامچی و پـردی سـێرات و قوربـانی و هـــەیت و هوتانـــەی كەتـــەواو موســـوڵمانانەن و نـــەقڵی ئـــاگری موســـاو كەوش و داكەندنی، سەرچاوەكەی قوڕعانە، ئەوانە موسوڵمانن و لەڕێگە كلابون و هیچی ترنـا. دەڵێـن دو كتێبـی یشـی یـن هەیـە كەیـەكیان مەصحـەفی ڕەشـەو لای بابەشـێخ هـەلچگیراوە ئەگـەر دەری خـات تـاعون دنیـا دادەگرێ مەلا خەلیلی شێخانی كە هاو ماڵی بابە شێخەو پەنجا ساڵە دەگەڵیا ئاشـنایەو لـەڕێ و شـوێن و قـانونی زەكـات و سـەرانەو داهـاتی میرودەسـتەڵاتی و فـەرمانڕەوایی كاهینـان بەسـەر پـەیرەواندا زۆر شـارەزایەو كتێبێكـی بەعـەرەبی لـە سـەر یـەزیدی نوسیوەو لەمەجمـەعی عیلمـی عـراق بەشـی كوردیدایە. لای وایە مەصحـەفی ڕەش یـان هـەر نـەبوە یـان زۆر لـەمێژە نـەماوەو درۆی تاعون هێنان بۆ پینەی ئەو نەبونە سازكراوە.

كتێبێكـی تـری یـەزیدیان هەیـە نـاوی (جلـوە)یـە بـە عـارەبی... خوێندومەتـەوە هەركـەس كتێبـی مشـایخانی موسـوڵمانانی وەك تەزكــرەتول ئــەولیاو شـــتی تـــر بخوێنێتەوە دەزانێ جلوە لەوانە وەرگیراوەو تـەنیا جیاوازیەكـەیان ئەمەیـە كـە هـەمو، موجیزاتی شێخان دراوەتە پاڵ شێخ هـادی لەكۆتایی ئەم وتـارەم تكـا لـە خوێنـدەواران دەكەم وانەزانن من لەسەر ئەو بیرە سورم و. لام وایە هەر خۆم پێكاومە. دەڵێم بـەبیری من وایە. هەركەسی تر ەوەی باشتری دەزانێ و جوانـتری بـۆ دەچێ، مـن ئامـادەم بڕواكـەی خۆم دەوێ كەمەوەو زۆریش سوپاسی بكەم.

* * *

شیاوی باسە وەك باسم كرد ئەم چیرۆكە سەربە ساڵی 1963یەو، تا ئێستا كە 1981میلادییە 19ساڵی بەسەردا- گوزەراوە.

**صفحهء اول موخره:**

**صفحهء آخر موخره:**

موسـوڵمانانی وەك تەزكـەرەتول ئـەولیاو شتی تر بخوێنێتـەوە دەزانێ جلوە لەوانەوە وەرگیراوو تەنیا جیاوازیەكەیان ئەمەیە هەمو موجیزانی شێخان دراوەتە پاڵ شێخ هادی. لـەكۆتیی ئـەم وتـارەم تكـا لـەخوێندەواران دەكەم وانەزانن من لەسەر ئەو بیرە سـورم و لام وایە هەرخۆم پێكاومە. دەڵێم بەبیری من وایە. هەركەسی تر لـەوە باشـتری دەزانێ و جوانتری بۆ دەچێ من ئامادەم بڕواكەی خۆم دەوێ كەمەوەو زۆریش سوپاسی بكەم.

**هەژار**








# نەوا سوێر، نەوا بێ خوێ

**هەژار**

باوك مەلا بوون دەبوایە بەچكەی مراوی مەلەوان بێ. پیلی گرتم و دامیە دەست مامۆستا و نامیە بەر خوێندن. بەرنامەی خوێندن وەك ڕۆژ ئاشكرایە چییە؟ سەتان ساڵە هەرچی هاتووە و ڕابردووە هەر ئەمەی خوێندووە. خودا یەكەو نابێ بەدوو، هەرگیز گۆڕانی بە سەردا نەهاتووە و هەر شتێكە و وەك بنێشتە خۆشكە جووراوە و جاوراوەتەوە و هەڵگەڕان و وەرگەڕانی بەسەردا نەهاتووە و هەر بەمۆری ماوەتەوە: جزمی عەممە و تەبارەك بەحینجە و بەرەوانی "ئینەهو كانە تەوابا"[1] مریشكە ڕەشەی سەوابا، لۆ مامۆستای كەبابا. مریشكی ڕەشمان بە قیرە قیر گرت و لۆ مامۆستامان برد. قافیەی "یەمنە عوونە لماعوون[2]" دەگەڵ پارویێك سابوون یەكت دەگرنەوە، جلكی چڵكنی مامۆستا شۆرا، جزمە تەواو بووە، ئاهەنگە بانگهێشتنی مامۆستا و هاودەرسانە، گیسكی بەلەمسیش لە ڕێگەی ئەم سەركەوتنەدا خوێنی خۆی بەخشی و گۆشتەكەی كرابە نەخشی سەر سینی ساوەر...

ئەمجارە نۆرەی وردە كتێبە: سمایل نامە و ناگەهان، سوڵتان جومجومەی ڕەحمەتی، سەنگ تراشە گێل و ماڵ وێرانەكەی كێوی توورو شەڕی باغەوان و ماری بێ كلك و دووپشكی كلك پان و بێ ئەمانی شێخ سەمیع. ماشەڵلا كوریژگە زۆر پێشكەوتووە و كاتی ئەوەی هاتووە پێ بنێتە حەوت خووانی ڕۆستەم و دەرزی دژوارو حەستەم بخوێنێ.

دەی كوڕم! بیسمی للاهی ڕڕەحمان ڕڕەحیم[3]، (بێ) حەرفی جەڕە، ئیسمی پێ مەجرووره، ارو مەجروور موتەعەللیقە بە...؟ – دەبێ ببوورن ئێستا لە بیرم نەماوە بەچییەوە بووا!! موزاف و موزافوئیلەیهی[4] یێكیش هەیە، دەبێ لەبەریان كەی و سبەی گوێت لێ دەگرم، ئەگەر وەك ئاو ڕەوانت نەكردبوو، گوێت دەگرم و بەم گۆچانە وات بێزار دەكەم ئەگەر دەرسیشت لەبیر بچێتەوە ژانی لە شت هەرگیز لە بیر نەچێتەوە.

خووایە هاوار!. بیسمی للا، دەزانم بیسمی للایە و ئەگەر ماناشی نازانم لە ترسی تاریكایی و چنۆكە هێندەم گوتووە هاتۆتە بەرم. ئەمجا ئەم جاڕو مەجرووره چییە لێی پەیدا بووە؟ موتەعەلیق چ قەرزێكی لەسەریەتی؟ موزاف و موزافوئیلەیهی دەبێ ناوی كام جڕوجانەوەر بن؟!

كێ دەوێرێ پرسێ: مامۆستا جاڕو مەجروور بەچی دەڵێن؟ نیازت لە موتەعەللیق و جووتەی موزافان چییە؟ ئەمجار كێ دەڵێ: مامۆستا خۆی دەیزانی، ئەوانە بەری چ دارێكن؟ خۆی وای خوێندووە و تۆش دەبێ وای فێر بی و بڕایەوە.. فێرنابی؟ كوتەك دەزانێ قۆناغ لە كوێیە..

جوان نییە پیاو مەدحی خۆی بكا، بەڵام من لێرەدا ناچارم، جوان بێ و جوان نەبێ، تۆزێك بەخۆم دا هەڵبڵێم.

لەزەمانی منداڵیم دا –یاخووا بێ چاوێنی بم– تا بڵێی زیرەك بووم، ناوبانگی بلیمەتیم بە هەموو گوندەكەمان دا گەڕابوو – گوندەكەمان بیست ماڵێك دەبوو– پیرێژن نەبوو نەزانێ: ئەم كوڕە ڕیوەڵەو مل باریكە چەند لە خوێندن زیت و وریایە و ئەگەر باسی من بكرایە دەیانگوت: خوشكم ئەو تڵفە –داروبەرد گوێی كەڕبێ– هەڵكەوتەیە كە هەر لە ئێستاوە دەزانێ بەنی لەرزو تا بابداو بەچەقۆ دەمی گورگ ببەستێ، ئەوە ئەگەر بمێنێ و بگاتێ بە خووا تەلاقی سێ بەسێش چا دەكاتەوە..

تەنانەت كەس و كارم زۆر جار ئەسپەندەریان بۆ دەسووتاندم و كووژەكەی شین و نوشتەی چاوزاریان لەسەر شان دروو بووم تا نەفەس و چاوی پیس كارم لێ نەكا..

جا ئەو ڕۆژە کە هەوەڵ دەرزی (عەوامیل)م خوێندبوو –تێشی نەگەیشتبووم– لەسەر گوێسوانەی بانێك هەڵوێستا بووم، دەستێکم نابووە بن کەوشەوەو بەفیزێکەوە سەیری کۆمەڵێك نەخوێندەوارم دەکرد خەریکی ناڵ کۆدنی ئێستریکی تۆرو چەمووش بوون. ناڵبەندەکە دارێکی دوو لکی هێنابوون بەنێکی گشتو دوو بادی لێ پێچا بوو، خستبوویە لیچی ئێستره بۆزەوەو جەرە بابەی دابوو، تا لەکاتی ناڵ کردن دا لە جووتە هاوێشتن و گاز گرتن بکەوێ.

زیرەکی بۆ ڕۆژێکی وانەبێ بۆ کەنگێ باشە؟. باوەڕ دەکەن یان ناکەن کەیفی خۆتانە، بەڵام سوێندتان بۆ دەخۆم: بەبێ ئەوە کەس پێم بڵێ من هەر بەزیرەکی خۆم هەڵم هێنا کە ئەم دارو پەتە جارو مەجرورەکەی دەرزی منە، کەوا بوو موتەعەللیق بزمارو ناڵ پارەیەو موزافو موزافوئیلەیهیش ئەوە دیارە: بیان کلکە، یان یاڵە چونکە موویان تێدایە. ئەگەرچی لەپاشان بیستمەوە کە نەخوێندەوارە بەسەرزمانەکان بەو دارو بەنە دەڵێن: لەواشە، بەڵام من هەرگیز نم سەلماندووەو ئێستاش هەتا ناڵبەندێك دەبینم کە لچ و لێوی بەکسمی باداوەو دەمو فلچی بەو دەردە بردووە، من جارو مەجرورم دێتەوە بیرو تەواو بەزیرەکی ئەوسای خۆم دەنازم.

باشە! ئەوا من ئەو ئاگر پارەیە بووم کە هیچ شتێکم لەبەر حاسە نەدەبوو، منداڵی دیکە چۆن لە ووزەیان دا هەبوو ئەو مەتەلۆکە دژوارە هەڵێنن و بەدەستییەوە دانەمێنن؟!

دەترسم پێم پێ بکەنن، ناهەقیشتان نییە، بەڵام ئەگەر بەووردی بیری لێ بکەینەوەو بەدرشتی لێکی دەینەوە، وابزانم قوڵپی گریانمان لە ئەوك دا گیردەخوواو خەمو پەژارە بەر بینگمان دەگرێ.

وەرن با پێکەوە ئەو کارەساتە بەسەر کەینەوەو ئاوورێك لە بنج و بناوان بدەینەوە، بزانین چۆن تووشی ئەو ڕۆژە ڕەشە کراین و بەو دەردە براین و چۆن تا ئێستاش لەم قوڕەشیلەدا ماوینەوەو هەر لێی دەر نەچووین.

وانزیکەی چاردە چەرخە، گەلی کورد لە خەویش دا خۆی بە سەربەستی نەدیوەو دەرفەتی پێ نەدراوە دروێك لە قالبی خۆی دەربێنێ، بێگانە دەستیان بەسەردا گرتووین، هەموو مایەی ژیان و مان و تەنانەت مێژوو و زمانیشیان بەتاڵان بردووین، ناچاریان کردووین بە زمانی ئەوان بخوێنین و ئەوەندەی بۆیان لواوە بەناوی ئایینەوە دەنا بەناوی شەق و زللەو دارو گوللەوە زمان زکماکی خۆمانیان لە بیر بردووینەوە. کاریان بەڕادەیێك گەیاندووە کە ڕەگەزی خۆشمان و زمانەکەشمان وا لەبەرچاوی سووك و چرووك بێ. ئەگەر ڕۆژێك لە ڕۆژان هەلیشمان بۆ هەڵکەوێ بێز لە خۆمان و زمانمان بکەینەوەو بەتیتوش ئاوڕ لە خۆمان نەدەینەوە.

بەعەرەبی خوێندوومانەو تێگەیشتووین کە ئەو زمانە زمانی کۆڕەو شارو ناو بەهەشتەو لەدەشتی مەحشەریشدا ئەگەر نەیزانین لاڵ و پالین و دەس بەتاڵین و لەناوچاڵین. ئەگەر کاربەدەستەکانی کوردستانیش غەیرە عەرەب بوون و بەسەرمان ڕاگەیشتوون و تێ گەیشتوون کە گەلیان دەبێ بە زمانی خۆیان بخوێنن. گوێیان ڕاکێشاوین و بەزمانی خۆیان دەرزیان داداوین و لەبیریشیان نەچووە خوێندنە کۆنەکەمان بەیادگار بۆ بهێڵنەوەو ئەو ڕەقەن و بەردەلانەمان پ بکێڵنەوەو لەناو دوو بەرداشا بمان هاڕن و نەمان پەرژێ بیر لەو بیرە بکەینەوە کەتێی کەوتووین و تێدا نوقم بووین.

تەواو وەك دەرزە مێژوویی‌یەکەی من، ئەوان جارو ئێمە مەجروورو مەسەلەش موتەعەللیقە بەهیچ فێر نەبوونی ئێمەوەو موزاف فارسی و ترکییەو موزافوئیلەیهی نەحوە عەرەبی‌یەکەیەو کەسیش نەیتووانیوە ماناکان بە کوردی بۆ لێکداتەوە، چونە ماموستاکانیشمان نەیانزانیوە کوندە لەکوێ دڕاوە.

تۆپی زەوی خولایەوەو تۆزێك بەرەو ئێمەش خزی و لە سووچێکی تەنگەبەری ئەم کوردستانە هەراو و بەرینەدا توانیمان ڕێگەی کوردی خوێندن بکەینەوەو کەم تاکورتێك نیوە ئاووڕێك لە خۆمان بدەینەوە.

لاوانی کوردی دەست و دڵ گەرم و خوێندەوار –خوێنەوار بە زمانی بێگانە– کە زمانە زکماکەکەی باب و باپیرانی خۆیان وا لەبەرچاو کەوتبوو، لایان وابوو لەزمانە مردووەکانەو هەربەشی شووان و گاوان و دەشتییەکانەو "ڕووی مەجلیسی یارانی نییە" و چڵکە هەورێکی هاوینەو هومێدی بارانی لێ ناکرێ و ئەوەندە لاوازو داڵ گۆشتە ئەگەر مارمێلکەشی بەگەروودا کەی نابووژێتەوەو خۆی بەسەر کاغەزەوە ناگرێ.. هاتن چاکی مەردایەتییان لێ بەلادا کردو هەرچی زمانی بێگانەکەیەو هەرچی زمانی شووان و گاوانە خۆماڵی‌یەکەی خۆشمانە بەگەسك و بێڵ ماشتیان و ناشتیان و سەر لەنوێ کەوتنە کارو زۆر بەکارامەیی زمانێکی سەربەخۆی ئەوەندە سەیرو سەمەرەیان بۆ ئیجاد کردین کە سەری فیل و نەهەنگیشی تێدا گێژ دەبێ، کوردییەو کوردیش نی‌یە!. تەرجەمەی عەرەبی‌یەو تەرجەمەش نی‌یە! و عەرەبیش نی‌یە! ئەدی چی‌یە؟

دەڵێن: مەلایێك لە دەرزی (ئەحمەدی)دا بەمنداڵێکی گوت: نەجل و وەلەد چی؟ ڕۆڵەیە!. منداڵ پرسی: ماموستا (چیرۆڵە) بەچی دەڵێن؟ ماموستاش لێی ئالۆزاو فەرمووی: کوڕم چیرۆڵە شتێکی گرمووڵەی جوان و حەنتیکەیە لەبازێڕان دەست دەکەوێ..

لەپێشدا دەمانزانی شکڵ چی‌یە، هەقی شەرعی بەچی دەڵێن، دەشمانزانی نیاز لەجامیعەی عەرەبی و دیفاعی مەدەنی چی‌یە.. بەڵام شکڵ بکرێ بە "ئێسك" و هەقی شەرعی "مافی پرۆژەیی" بێ و جامیعەی عەرەبی "مزگەوتی عارەبان" بێ و دیفاعی مەدەنی کرابێ بە "بەرەوانی باشی بۆزغی"، تۆ دینتان لە "چیرۆڵە" سەیرترن یان نا؟! جا ئەوە هێشتا باسی "حەیتە" و "ڕاژە" و "فلقەکۆن" و "لاکێشی تەریبی" و چەند شتی لەوە سەیرترم بۆ نەکردوون.. شیرم لەسەرت دا بێ، تەپ و تۆزو هەرایەکە سەگ ساحێبی خۆی ناناسێتەوە.

کوڕه وەره بمکوژه!. کاغەزی کاغەز ئاسایی بابەڵباب و جەددو عابادی کورد بوون و بە کوردی ژیاوە کەچی فرێمان داوەو کردوومانە بە "تیانووس؟" لەسەر قافیەی ئۆقیانووس!

شاعیر! شاعیری کلۆڵ و نەگبەت نیوەی خەڵکی دنیا دەزانن ئەو ناوە بۆ چ ماڵوێران و چارە ڕەشێك دانراوە کوردەکەش پێی دەگوت شایەر– کرا بە "هۆنەر" گوتمان باشە، "بوێژ" یان بۆ دۆزیەوە پیرۆز بێ، کرا بە "هەستیار" دەنگمان نەکرد. وا ئەم ڕۆژانە سەر لەنوێ ناوکی بڕاوەو بانگیان بەگوێدا لێداوەو ناویان ناوە "هەڵبەستێنەر"، ئەگەر خووا نەیکوژێ بەدوو ساڵی تر وەك ووشتری عەرەب خاوەنی سەدو پەنجا ناو دەبێ.

ئەو تۆزەی بە نموونەم هێنانەوە تنۆکێکە لە دەریایێك و چڵە کایەکە لەبەرانبەر چیایەکدا. ئەگەر قۆشەو دراوێکی لەخۆمان زیادمان هەبێ و بە ووردی بەشوێن ئەو ووردە کتێبنەدا بگەڕێین کە لەپاش یەزدەی ئازارەوە لە پەستاو بەبێ ووچان دەخرێنە بازاڕەوەو کات و تاقەتیشمان هەبێ بیان خوێنینەوە، ئەوسا دەردەکەوێ چەند ماڵ وێران و بریندارین و کۆنە برینمان چەندی وە بن داوەو بەهیچ داو دەرمانێك چاری ناکرێ و کەس نی‌یە پێی بچارێ!!

برا کوردەکانی کوردی نووسی خۆشەویستم! ئەیزانم ئێوە لە دڵ پڕی و دڵ گەرمی خۆتانەوە دەڕوانن و دڵسۆزیتن هەڵی ناون کە ئەمە بکەن. تازە تۆزێك لە بەندی گرانی زمانی بە زۆر سەپاوی بێگانە ڕزگارتان بووەو دەتانەوێ هەرچی زووە بەیەکجاری کوڵ و کۆی دڵی خۆتا بڕێژن و ئەم ڕێگە دوورەی کە مەودای لە هەزار ساڵ پترە بە ڕۆژێك بەشەوێك بیبڕن. واتا ئێوەش لەشارەوە بەنووکی قەڵەم شۆڕشتان بەرپا کردووەو شۆڕشەکەش زۆر پیرۆزە. بەڵام دەبێ بزانن، هەر شۆڕشێك ئەگەر بە ڕێکو پێکی نەڕوا بەڕێوەو شۆڕشگێڕان هەموویان ئاگایان لەیەکتر نەبێ و هەر کەس هەرکەسەو پاشا گەردانی و بەرهەڵدایی بێ سەر ناگرێ و چی لێ سەوز نابێ. ئەگەر شۆڕشگێڕان گوندێکی خۆیان ئازاد کردو مەکتەبێکی تێدا بوو، ناشێ بیڕووخێنن چونکە دەسکاری داگیرکەرە. گەرەکە بیکەن بەفێرگە بۆ منداڵانی ئازادو بەهرەی لێ وەرگرن، پیاو نابێ لەداخی خەڵك سەری منداڵی خۆی بشکێنێ. ئەم پەلەو هەڵپەیەمان لەفڕیدانی ووشەی بێگانەو داتاشینی بێ سەرەو بەرەی ووشەی تازە بابەت و ناڕێك و لەشان گران و ئاگا لە یەك نەبوون و ڕێك نەکەوتنی نووسەران لەسەر ئەو ووشانەی کە هەر کەسە بەشەو لەماڵەوە بەتاریکی ڕێکی دەخا و بەڕۆژ ئەیخاتە بازاڕەوە، زیان بەمنداڵی کورد دەگەیێنێ و سەریان لێ دەشێوێنێ و هەر وەك لەو دەچێ کە پیاو مەدرەسەی پێشووی گوندەکەی بڕووخێنێ.

من دەڵێم با تۆزێك لەسەرخۆتر بڕۆین و زۆر لەسەرنگریێ بوون بترسین. با نەخوێندەوارو دەشتەکی‌یەکانمان بکەینە مامۆستای زمان و بەلامانەوە شەرم نەبێ کە لامان وابێ ئەوان لەشارستانی خوێندەوار باشتری دەزانن. ئەو ووشەی دەمانەوێ لەجیاتی ووشەی بێگانە بینووسین لەوان پرسین و ئەگەر ئەوان نەیان بوو باجارێ هەر ئەو کۆنەیەی چەند ساڵە بیستوومانەو فێری بووین دەکاری بکەین و وەکاری خەینەوە تا ئەو ڕۆژەی کە فەرهەنگێکی وامان بۆ دەرەخسێ هەمووو زاراوەکانی زمانەکەمانی تێدا جێ دەکرێتەوەو هەمووی لە جێیێکا کۆ دەکرێتەوە. ئەوساش چەند کەسێك لە زانایانی کوردی زانی بە ڕاستی لە دەوری یەك کۆبینەوە و ناوی لەبارو ڕێك بۆ ئەو ووشانە بدۆزنەوە کەلە کوردی‌یە خۆماڵیەکەدا دەس ناکەوێ و کارێکی واش نەکەن کە لە کۆنەکەی فێری ببوین گرانتر بێ و کورد نەتولنی‌زووی فێر بێ.

با بە دەورو بەری خۆمان دا بڕوانین تا بزانین فارسەکان و تورکەکان و هیندی و پاکستانی بە هەزاران ووشەی عەرەبی‌یان لە لایەو دەکاری دێنن و دەیخوێنن و یەکتری پێ دەدوێنن و هیچ زیانێکیش بە عەمرو ماڵیان نەگەیشتووە. هەر عەرەب بۆ خۆی بە سەتان ووشەی کوردی و فارسی و ئاشووری هێناوەتە ناو زمانی خۆیەوە و کەسیش پێی ناڵێ پشتی چاوت بڕۆیە.

برا گیان! وەك براییکی بچووك هاوارتان لێدەکەم و دەس دەبەر پشتێنتان وەردێنم، بەزەییتان بە منداڵە کوردەکاندا بێتەوەو تۆزێك لەو گەرمو گوڕی و دڵ پڕی‌یە دابەزن باشترە، چونکە من بڕوام وایە کە ئەگەر نووسینە کوردی‌یەکەمان بەم ڕەوتە بڕواکە ئێستا گرتوویەتەبەر دارێکە بەر ناگرێ و سەر لە خوێندەوارو نەخوێندەواریش دەشێوێنێ بە ڕاستی ئەم سەربەستی‌یە لە داتاشینی ووشە ئیجاد کردنی زماندا دەگەڵ خوێندنی سەد ساڵ لەمەو بەرمان دا نەك هەر جیاواز نی‌یە، ئەگەر بوێرم دەڵێم هێشتا خۆزگە بەو، ئەگەر ئەو بێ خوێ بوو، دەکرا تۆزێك خوێی تێ کەین و بوخرێ، بەڵام ئەمەی ئێستامان زۆر سوێرەو جەرگ دەبڕێ، دەسا دەغیلتان بم نە وا سوێر و نەوا بێ خوێ، با وا نەبێ ئەگەر بیچێژین بیرێژین.

## پەراوێز:

(1) "انه كان توابا".
(2) "يمنعون الماعون".
(3) "بسم الله الرحمن الرحيم".
(4) "مضاف ومضاف اليه".

*لە ژمارە2ی ساڵی (1)ی (نووسەری کورد) لە نیسانی1971دا بڵاوکراوەتەوە.

# یادی مامۆستا سەجادی

هەژار



دۆستێکی زۆر خۆشەویستم ڕووی لێ ناوم. چونکە چەند ساڵ لە بەغدایە دەگەڵ "علاء الدین" ژیاوم. زۆر ە نیزیکەوە دیومەو بە هەموو باران ناسیومە بەیادی کۆچی یەکجاری کە ئەم بەینانە ڕووی‌داوە کورتە وتارێك بنووسم.

من گەرەکمە نووسینەکەم تایبەتی بە تاکێك نەبێ. دەگەڵ ڕێز لە نووسەر گرتن سەرکۆنەی ئەوانەش بکەم کە بەدوو ربان دەپێون و هەرتاوێ جۆرێ داخێون.

جارێك لە گۆواری "هەولێر" کە لە هەولێرێ دەردەچوو، خەبەرۆکێکم نووسیبوو کەچی لەبەر بەختی کەچم دەچاپداندا تێك درابوو، کەس تام و چێژەی لێ نەکرد، کورتە باسەکەش ئەمە بوو:

"ڕۆژێك سەیری دووکانێکی بەغدام دەکرد. چەقەڵێکی مۆمیایی کراوی لێ داندرا بوو، لەژێر قاچی‌یەوە نووسرا بوو (بیست و پێنج دیناری تەواو)... من سەری زمانی خۆم گەست، هات بەدڵما، هەیاران! ئەم مام چەقەڵە موحتەرەمە ئاخۆ دەبێ بەزیندی سەر شاعیر، نووسەر، هونەرمەندێکی کورد بووبێ. لەژیانیدا لە برسان و لە ترسان شۆقرەی نەبووبێ و ئێستاکێ لاشەی مۆدکی بەم دەرد و مەخسەرە چووبێ؟ کێ ئەزانێ؟؟ هەزار دانە بە زیندوویی فلسێ ناژین کەچی یەکێك بەمردوویی بایی بیست و پێنج دینارە!! بە خوای سەیرە!! لە درێژایی مێژووی پڕ نەگبەتی کورددا، هەر شاعیر، هەر هونەرمەندێك لەناو کورددا هەڵکەوتبێ و هونەرەکەی بەزمانەکەی خۆی ڕانابێ و شیعری بە کوردی دانابێ، هیچ کەس ئاوڕی وێ نەداوە، بەسووك تەماشای کراوە، بوویتە مەسەل "هەر کەس پینەی پێوە دیار بێ، جلکی شڕو بەتیتۆڵ بێ، کەوشی چەك و بەبزمارو لارو خوار بێ. دەڵێن لاچۆ تەرحت هەر لەشاعیر دەکا!!... کەس تەنانەت تووشی بە کڵاوی ناپێوێ، کەس پێی ناڵێ کەرت بەچەند"

هەر بۆیەشە بەشێکی زۆر لە نووسەرانی بەچکە کورد، لەبەر ناچاری و هەژاری وەزوان نامۆیان نووساوە و خۆیان و مناڵ و کاڵیان لە مەرگی بێ کوللێرەی لە پەنایەك حەشار داوە. نامەوێ مەلای جزیری، خانی، نالی حاجی، مەولەوی و زۆری تر لەو کەسانەی ئێستا مایەی شانازی کوردەکانی کوردستان و کوردناسانن، بۆ نموونە بهێنمەوە، لازم ناکا مێژووی کۆنتان بۆ بخوێنمەوە، ئەمەوێ هەر بەسەرچڵی و مەویژ نموونەی کەویژێك ئەوانە وەیر بێنمەوە، کە هاوچاخی خۆمان بوون و دەماننناسین.

مەلا مارفی کۆکەیی ئەگەر بێژم لە برسا مرد ڕەنگە باوەڕم پێ نەکەن چونکە ئەودەم نانی وشك زۆر هەرزان بوو....

مەلا ئەمجەد ئەو هونەرمەندە بێ وێنەی کە نازناوی شیعری (کاک) بوو، ئاغای لێ ببووە رموون‌و لەچەند جێ دێ بەدەریان کرد.

قانیع تا مرد نان‌و دۆی خۆی ڕۆژێك لە پەنایەك نەدیت.

حاجی تەوفیقی پیرەمێرد کە حاڵی ماڵیشی خۆش بوو، هەر چونکە کمونیست نەبوو، کەس ڕۆژنامەکەی نەدەکڕی، دەیانگوت دەستندە خۆری ئینگلیستانە.

فایق بێ کەس کە چریکەی گوێی دوژمنانی کەڕ دەکرد، دوولێفەی لەماڵدا نەبوو کەخۆی‌و منداڵەکانی پێ داپۆشێ بە قەرزداری جوولەکەی ئارەت بەقەرزدەر مرد.

گۆران ئەو ئەستێرە گەشەی ئاسمانی ئەدەبیاتی کورد، بۆ دابین بوونی بژێوی، دەگاتە یافای فەلەستین وتار بێژی رادیۆی "شەرقی ئەدنا" بێ...

جگەر خوون پەنجا ساڵ پتر بۆ شیعرو چیرۆکی کوردی چەوسایەوە، لە جیاتی نان خوێنی جگەری خۆی دەخوارد. چەندە لە کوردستان ژیا و من دەمناسی گەسك لێدەری کۆڵانان لەو تێرتر بوون، کەس ئێرەیی پێ نەدەبرد. ئەوانە لەژیان ئاوا بوون، لەپاش مردنیان چاوا بوون؟

ئەگەر تاك‌و تەرایەکیان وەك مەلا مارف‌و قانیع‌و مەلا ئەمجەدو چەند هەناسە ساردی دیکەش، تەرم نێژان لە گۆڕستان بەچەند خودا عافووی بکا گوتن بلاوەیان لێ کردن‌و چوون هەر وون‌و ناویان دەگەڵ لاشیان ون بوون..؟! لەوشارو شوێنەوارانەی لەو پارەدارانەی زۆر بوو کە خۆیان بەکوردپەروەرو ڕۆشنبیری دۆستی نووسەران دەزانی. لەپاش ساڵی سلاماڵی وەخۆ کەوتن، بۆ یادی فایق بێ کەس‌و پیرەمێردی گردی یارەو مەرگی گۆران میوانی‌و نان‌و خوان درا. ڕووپەڕ بە جارێ وەرگەڕا، چۆن دەبێ لەبیرمان بچن؟ ئەشێ ناشتنی لاشەیان، ئەم هەموو کردە باشەیان لە لایەن ئێمەی ڕۆشنبیر کە لە کوردی پەرستیدا ئاوی شەوێ شلوێ ناکەین وەبیر حەشاماتی مەردم بخرێتەوە، دەتگوت مولوودنامە دەکەن، بەر دەرك‌و بان‌و بێڵایی ئاو ڕشێن کەن، بەڕان راخەن، سەنیرو پاڵە پشت داخەن، شتی بۆنخۆش بسووتێنن، چراو مۆمان داگیرسێنن، دنیا بکەنە چراخان، چەند کەس. هەر گوڵاو بپرژێنن، کابانی دەستاو خۆش بانگ کەن، قۆڵی بە بازن هەڵماڵن تەشك‌و داوێنی لێ هەڵکەن، پلاو مەلاوی زۆر چێ کەن با چەور بێ، کشمیش‌و خورماشی تیکەن خۆرشت‌و ترشك زۆر خۆش بێ، با هەموو چڵەیەك بۆش بێ، وێڕای هاوسای کۆك‌و پۆشتەو دەروجیران، لەو ڕووتانەش بگێرنەوە کە دەم دە شیعران وەردەدەن‌و زۆر تامەزرۆن. با بەخێری گیانی مردووەکە تێر بخۆن. هەموو ڕۆژێ هەڵناکەوێ کفتەی مفتە وا بەلاش‌و بە لێشو بێ.... سا ئەوانیش لەسەریانە بە وتاری بایەخدارو بەشیعری تەڕو ئاوداریان کۆڕەکە برازێننەوە.

لەپاش مڕ بوون لەخواردن‌و لەپاش پڕ بوون لە شەکراوان‌و مەکراوان، هەر دەم یەکێ لەسەر بەرزەك قوت دەبێتەوەو بەوپەڕی گفت‌و لفتی خۆش دەس دەکا:

"خۆشك‌و برایانی بەڕێز تکا دەکەم هەسنە سەرپێ، دەقیقەسەك قڕوقپ، فەزای بێ دەنگە، ڕەنگە هەر لەم دەقیقەدا گیانی نازداری کۆچ کردوو لە بەهەشتەوە بفرێتە سەر ئەم کۆڕەو ببیسێ چۆنی باس دەکەین!! دایکم دەیگوت پلکە بەسێ لە خاتوامانی مامانی دەگێراوە کە ئەم زاتە ممبارەکە هەر ئەو ساتەی سەری لە هێلکە جووڵاوە، سەهەندەو بلیمەتێك بوو هەموومان واقمان وڕمابوو. مەمك مژینی مەوزوون بوو، گریانەکەی لە ڕەوتی شیعری ئازاد بوو. بیلامانێ، بیلاتەژبی، با پەرژینەکە بە گوڵ بێ ئاوپرژێنی بەقافیەو مافیە دەردەچوو، لە بێشکەدا بە گرۆگاڵی منداڵی بەیتی وای دەهۆندەوە نوون لەچاوی ئێمەدا بێ لەودا نەبوو. ئەی هەزاران ڕەحمەت لە گۆڕی ئەلفاتیحا...".

یەکێکی تر قەسیدێکی دوورو درێژی داناوە مردوو دەلاوێنێتەوە. شیعرو وتار وەکوو قەتاری وشتران بەزنجیرە دێن‌و دەچن. لەسەریەك کەڵەکە دەبن. های لەو کوڕەی چالاکانە فریاکەوێ‌و ئەو یادنامەیە چاپ بکا. لە سایەی مەرگی خوا بەخشیو ئەوەندە پوول پەیدا دەکا کە مردووەکە خەونیشی پێوە نەدەدیت.

وەك بۆیان گێڕاومەتەوە کە تەرمی پاکی جگەر خوون لەسوێدەوە هاتۆتەوە بۆ گۆڕستانی قامیشلی "لەلایەن کوردەکانەوە پێشوازییەکی وای لێ کراوە کە کەمتر وێنەی دیتراوە. بەسەتان بگرە هەزاران ترومبیلی هەواداران لەو دەشتەدا وەکوو مەڕی حاجی تاغی سەریان دەپاشڵی یەك ناوە، سەد هەزاران لەناشتنیدا بەشدار بوون. ئەی خودا خێریان بنووسێ!

خوشك‌و برا کوردەکانی هاو زەمانی هاو زمانم، دەزانم ئێوەش دەزانن ئەم قسانە ئەفسانە نین سەربەخۆ هەڵمبەستبێ، ئێوەش ئەوانەتان دیوەو بەدڵتاندا تێپەڕیوە بەڵام وەك من دەخۆتان ڕانەدیوە دەری بڕن. وەرن هەر لەخۆتان پرسن تو خوا مەلا ئەوە ئاردە؟!...

بەبڕوای من ئەو خۆ لە زیندوو بواردنەو بۆ مردنی خەم خواردنە، ئاکارێکی نزم‌و نانەجیبانەیە، ئێمەی کورد خاکەسەرو بێسەرو بەر، ژێر چەپۆکەی داگیر کەران، لەناو خوداو لە هەندەران. خێرەومەندێك دەس ناکەوێ دانی خێرمان پێدا بنێ، دروویەك لە لەشمان دەربێنێ هەزارو ئەوەندە ساڵە لەو چاڵەدا قەتیس ماوین‌و بێ ناوین. نەیارانمان ویستوویانە زمانە زگماکەکەمان لێ بەربەست کەن. لەسایەی بێ زمانییەوە. بەیەکجاری مافی ڕەوای نەتەوییمان پێ پەست کەن. ئەگەر من‌و تۆش نەزانین ئاغاکانمان باش دەزانن هەر زمانە قەباڵەی بوونی گەلانە، هەر گەلێ زوانی نەمێنێ قەت نایکرێ سەر هەڵێنێ‌و خۆ بنوێنێ مافی ڕەوای خودا داوی وەدەست بێنێ.

هەر گەلێك یان هەر منداڵێك لە گەڵیدا زمانی تایبەتی بە خۆی یان فێر نەبووە یان لە بیر براوەتەوە. لەناو بۆتەی ئەو بیانیەی زمانەکەیان فێربووە تواوەتەوە.

لەو قەرارەی ئەمان لەو هەموو ماوانە بە لەزو هەڵەداوانە ویستوویانە زمان و فەرهەنگەکەمان بنەبر کەن و کورد سڕکەن و گیان و دڵی لە فەرهەنگی خۆیان پڕ کەن. ئێمەش لۆژ لۆژ وەك دەگوێی گادا خەوتبین و لەو بیرە دەرنەکەوتبین کە ئەوان ڕۆیان هێشتووینێ، نەشمانزانیوە چ باسە. چۆنە تا ئێستا هەر ماوین و یەکجارەکی نەفەوتاوین؟.... کورد گوتەنی تەگبیرو تەغدیر لێك جودان هەموو شت بەدەستی خودان. خوا ویستوویە ئامیانی ژیانمان بمێنێ، چەند کەسی وا بخولقێنێ، زۆر گوێ نەدەنە نان و ئاو، بێ بەرگ و پێڵاو ڕابوێرن لە گۆشت و پلاو واز بێرن. دڵ دان بە کیژی دنیایی، ئەوینی پاکی خودایی، خۆشەویستی زێدو خزمان هانیان بدا هەستی ناو دڵ و هەناوان بە زوانەکەی دای و باوان بدرکێنن ڕووپەڕانی پێ برەنگێنن، ڕەنگە لەبەر خۆ گوتبێتیان: خۆمانەبێ و دۆمانەبێ، نەك بەزوانی بێگانە بێ....

جزیری و خانی سەرپلی کوردی نووسینیان خۆش کردو بەرەو دوای یەك بوێژانمان داویانەتە سەر ئەو ڕچەی ئەو دوانە بۆیان شکاندووین و ئەوانە تێیان گەیاندووین بەکوردی نووسین ڕەوایە. ئەگەر چەند دەورو زەمانێك کورد هەر برێتی لە بەیت و هۆتەی کۆنە بوو، دیسان شوکرانە بژێرین کە لەسایەی ئەوانەوە زۆربەی وشەی زمانمان پارێزراو لەبارەی مەبەستەکانی جۆراو جۆری ئەدەب و ئەدەبیاتەوە زۆر هەژارتر لە خەڵکانی تر نەماینەوە. خۆ دیاریشە پەخشان نووسین بۆ پاراستنی زمانمان لە شیعرو هۆتە باشترە. چونکە مەیدانی نووسینی نەسرو پەخشان تا بێژی پان و بەرینە، نووسەر ڕیشی دەبەردەستی وەزن و قافیە و هەیت و هووتی تردا نیە... خوداو ڕاستان لەم چەرخی چاردەهەمینی ئیسلامیدا ئەم دەروەشمان لێ کراوەو پەخشان و داستان نووسمان لێ پەیدا بوون، ئێستا کە زۆری وامان هەن، بەهۆی نووسینی چیرۆك و کردەوە کۆیی دیرۆکان دەستەبەری هەرمانی کوردی‌یەکەمانن.

یەکێك لەو پەخشان نووسانە لە زەبرانە "سەججادی" بوو کە دەمەوێ یادی بکەم.

پێش حەفتا ساڵ لە ماڵ مەلایێ سنەیی منالێك هاتە سەر دنیا ناو (علاء الدین) یان لێنا. ئەلف و بێشکەی پێ خوێندراو نرایە بەر فەقێیەتی. بەنانی دەقنە خواردن و بە ئالێ بابا ڕابواردن سوختە بوو بە موستەعیدو موستەعید کرا بە مەلا. چۆن مەلایەك؟ لە عارەبی و فارسی و کوردی وریاو پیتۆڵ. بەڵام جلك شڕو شۆڵ و تەبەك و باخەڵ چۆڵ و هۆڵ. دەگەڕا بە شوێنی ناندا لە بەغدایە گیرسایەوە. لەسایەی چەند خێرەومەندێك بەگیرەگیر پێش نوێژیەکی لە کونە گورگێکا دەس کەوت کەناونرابوو مزگەوت. حوجرەیەکیشی بۆ جێ خەوی مەلا هەبوو. سەد خۆزگە بە حوجرەی نالی. من ناوم نابوو کونە ڕەش. بەڕۆژ دەبوو چرا هەڵ کا. بەشەو چۆنی تێدا هەڵ کا؟. هەر حۆی و خودا بیزانێ.

ئاوارەیە، غەوارەیە. گوناهی هەرە گەورەشی کورد بوونیەتی ساڵەهای ساڵ ڕۆژو شەوی و کات و ساتی لەو حوجرەدا لەسەر حەسیر ببووە سیپاڵ. جا مەگین چلۆنکایی با دەنا هەرگیز ئەو زیندانەی جێ نەدەهێشت. هێشتاش هەر لەوە دەترسا کوردی نامەرد کەماڵم هەقە زۆریش بوون، تۆمەتی ئێرانی بوونی بەملدا دەن، لەپاش گرتن و جزیادان بۆ ئەودیو سنووری ڕادەن. ئەو نانە وشکەشی بچێ کە ئێستا بێ منەت دەیخوا...

جیا لەکاری پێش نوێژی‌یەکەی هەر پێنج فەڕزان کە بەحاڵ نان و بژێوی لێ دەردەهات بەڕۆژو بەشەو بێکار بوو. بێکار لە بەهەشتیش بژی وەڕەز دەبێ خۆی لەکن خۆی ناحەزە بێ و قێزی لە خۆی دەبێتەوە.

خۆ نەمازە سەججادی کۆنە گەڕیدەی دنیا دیدەی قسە زلی بە بالاچووکی والەش سووك بە بێکاری لە ژوورێکی ڕەش و برشی تەسك و باریك و شەدارو ئاوا تنووك و تاریکدا دەس لەبان دەس کارێ نەکا. هەر دەشژی با مەرەکەف لەقورم و مازوو دروس کا، قەفە چیتك و کاغەزی کاش زۆر هەرزانە، بابەختی لە نووسین تاقی کاتەوە.

بەختی لەم ئەزموونە گرتی: بۆ یەکەم جار لە گۆواری "گەلاوێژ"دا ناوی سەججادی خۆی نواند. نیزیك دەساڵ ئەم ناوەمان لەسەر بەرگ و ناوەڕۆکی ئەو گۆوارە بایەخدارە دەخوێندەرە. ئیتر بەری بەر هەمدانی کرایەوە، وردە وردە بووژایەوە، مێژووی ئەدەبیاتی کوردی، باسی شۆڕشەکانی کورد، گەشت و گوزار نامەکانی، فەرهەنگۆکی بەعارەبی و فارسی و کوردی کتێبی ڕشتەی مرواری کە ئێژن بوویتە هەشت بەرگ، بەرهەمی (علاء الدین)ن. ئەمە جگە لەوتاری ناو ڕۆژنامەو راوەی شیعری شاعیران و زۆری تریش کە هەژماردنیان دژوارە.

زۆر سەبووری بەمن دەهات زۆر جار لەکونەڕەشەکە سەرم دەدا. بەیتێکم بۆ وەرگێڕابوو بۆم خوێندەوە:

**تۆنەمردووی ئەی (علاء الدین)ی سەججادی نەسەب**

**خاوەنی مێژووی ئەدەب، پێش نوێژی پێخواسی عەرەب**

دەیگوت: ئەرێ پێخواسەکە منم یان پاش نوێژەکانمە!!

لەو ژیانە پڕ لە ژانەدا تەمەنی گەیی‌یە حەفتا ساڵ.. ئەو هیچ لەدەست نەهاتوانەی هەر ئیراد گرتن دەزانن و هەرگیز لە هونەر ناڕوانن کردبوویانە ئامانجی تەوس و توانج و زەردەیان لێ دەدۆزیەوەو لەیەکتریان دەقۆزیەوە: مەلا دەس ڕژد چنۆکە، ترسەنۆکە، گۆشەگیرە، لەم ناوە هەر خۆی لەبیرە، سەر بۆ حاکمات دەنەوێنێ، لە مەجلیسی تەشریعی کە جاشخانەیە چۆن قەبووڵ دەکا بەشداربێ و لەنو کۆمەڵ لەکەدار بێ.

ئیتر سەرتان نەئێشێنم پێ هەڵگوتن بە دینار غەیبەت کردن بە خەڵوار بوو ئەم بەدگۆیی و بەناوۆیی لێ ڕوانینە تا دەمی

ئاویلکەدانی، تا دوا هەناسەی ژیانی دوایی نەهات. تا خەبەر هات کە مامۆستا (علاء الدین) عەمری خوای کرد...

ئەمجار وەرە گوێ لە ئاخ و ئۆفان بگرەو لەداخی دوو زمانان مەمرە. هەر ئەونەی بە زیندوویی کەوڵیان دەکرد. شین و چەمەرەیەکیان کرد بەداستان بیگێڕنەوە. مخابن بۆ ئەو جوان چاکە جوانە مەرگە، لەوەتا پەلکی وەریوە هەموو کوردستان هەتیوەو سەد بەیت و بالۆرەی تریش.

خوشکی دڵسۆز، کاکی برا، ناڵێم زۆر، بەڵام هەر تۆزێك ئینسافتان بێ، ئەو کەسانەی پیشەیان کوردی نووسینەو گەشە بەزمان و فەرهەنگی کوردی دەدەن هەتا ماون وا بەسووکی سەیریان مەکەن. کەوسکێك ڕێزیان لێ بگرن. واتا بە خوت و خۆڕایی نەجنێو نەپووڵیان پێ بدەن، نە خراپیان پێ بکەن نەخێر... چونکە نووسەر ئەگەر فێری سواڵکەری بوو، خۆشی و هونەری هیچ ناژین.

با ئاکارە نالەبارەکەی کەونارن بەروپشت کەین. نووسەرێك کە بۆ بەدبەختی هەر زیندووە خۆتان وای دانێن مردووە. ئەو پووڵ و پارەی لەیادی لاواندنەوەی پاش مردنی بەخت دەکرێ لەناوخۆدا کۆی کەنەوە. کرو بەرهەمی نووسراوی هەڵسەنگێنن بینرخێنن، هەڵەو پەڵەی ئەگەر هەیە لێ بژار کەن. بەو دەسمایە بۆی لە چاپ دەن، لە فرۆشیارو پارەکەی خۆتان بەزیادەوە وەرگرنەوە لەو دزانەی بپارێزن کە ئەمڕۆ لە کوردستاندا کاریان بۆتە دزی و فزی لە شاعیران و نووسەران، بێ پرس و ڕا کتێبان چاپ دەکەنەوەو ئاوڕ لەویژدان و شەرەف نادەنەوە ڕاستی ئەمانە خەتەرن و بەر لە زۆر نووسەران دەگرن کە بەکاری خۆ دڵخۆش کەن. لاوێکی کورد کە بزانێ هەرچی نووسی ئەو دزانە هەر لە حەوا دەیقۆزنەوەو هەق مەقی بەرپێ دەدەن چۆن واز لە نووسین ناهێنێ و ناچێ کارێکی تر بکا کە بەرهەمێکی پێ بگا؟...

ڕاستان دەوێ ئەو کەسانە نەنگی ناو شارەکانتانن، تا دەتوانن لەناو خۆتانیان دەراوێن. با ئاکاری کۆمەڵگاتان وەك ماڵ و کۆڵانەکانتان پاك و خاوێن ڕابگیرێ.

مامۆستا سەججادی کە مرد، ئەگەر کاری ناپەسەندیشی کردبێ، کە نەشی کرد. دەگەڵ خۆی بردە بن گڵی. ئەو بەرهەمەی لەو بە میران ماوەتەوە هەر وشە کوردیەکانی بێ و هیچی تر نا، دەتوانین فەرهەنگێ قەبەی لێ پێك بێنین و بیکەینە مایەی شانازی و بە "علاء الدین" بنازین. ئەو کەسەی چوو مێژووی ئەدەبە کوردی‌یەکەی بێ پرس و ڕای ئەوچاپ کردو هەقەکەی خواد، خۆی لەسەرکۆنەی ویژدان بوارد. بەلامەوە ئەو بە سووکی لێ ڕوانینەی نووسەرانی بەکارمانە پوختەی وتار تکا دەکەم شاعیرو نووسەرەکانتان کە پارێزگاری فەرهەنگ و زمانتانن هەر بەزیندوویی مەمرێنن و بە مردوویش پێی ناوێ بە مۆمیایی بیان هەنوون و تازە نرخیان بۆ دیاری کەن مەیکەن بەنەقڵی چەقەڵی کابرای بەغدا!

**خودا حافیز**

*لە لاپەڕە (21–25)ی ساڵی یەکەمی هاوینی 1364ی گۆڤاری سروەدا بڵاوکراوەتەوە.






# هەژار هێمنەکەی جاران

هێمن

منو هەژار لەمندالّیەوە هاوالّ بوین، وێکڕاپەرەوازەو گەورە ببوین، هەرەتی لاوەتیمان پێکەوە لەناو چواردیواری قورماویو پڕ لە جۆلاّتەنەی حوجرەی کۆنە مزگەوتان دا رابواردبو.. ئێستاش وا بەسەر پیری، پاش بیستو ئەوەندە سالّ لێك دوریو هەلّبڕانو تامەزرۆیی یەکترمان دەدیتەوە... نەهاتیو لیّ قەومان هەردوکمانی کەنەفتو کەلەلاو پیرو زۆرهان کردبو. ئەو ئەستور ببو من لاواز، ئەو لەبەر ورگو گەدو گیپالی پشوی لیّ بڕابو، من لەبەر کزیو بیّ هێزی هەر لاکەی سەرم دەهات.. دیسان سەرمان گەیشتەوە یەكو بوینەوە: یەکمالّ. مالّی چی؟ دولێفەی شڕو پەتو، سەرو سەرینی پڕ بلاّوو هەلّوەشو، هەر یەکە تەختە شکاوێك بەهەردوکمان چرایەكو چادانێكو دوپیالّەی ڕوکێشو ئاوخۆرەوەیەکی گلّێنەو ئاویّ بێنەو دەستان بشۆ.

ژورەکەمان بە وشکە بەرد داندرابو. دیوارەکانی خواروخێچ بون، لە هەمو لایەکەوە زگیان دابو.

هیچ دیوێکی سواغ نەکرابو، باگێرەوەی نەبو، ئالّودارەکانی کەڕواوی بونو چەکەرەیان دەرکردبو.

هەلاّشەکەی داچۆڕابو، بۆ ساردێکی پیسی لیّ دەهات.. هێندە تەنگو تەسك بو بەچیڕە چیڕ جێمن دەبۆوە. هێند تاریك بو بەنیوە ڕۆ ژرای دەویست. هێند نەوی بو تێیدا هەلّ نەدەهاتینەوە..

قسەی خۆمان بیّ زۆریش تێروپڕ نەبوین. دەگەلّ پێشمەرگە جوانو جحێلّەکان لەسەر خوانێك کۆدەبوینەوەو ژەمەنانمان یەك بو، زێدە پاروی چەورو نرمی پیری چلّێسو گردەنشینمان بۆ دیاری نەکرابو.. گوزەرانمان پێکەوە مێخۆش بو: ترشو شیرن تێکەلاّوبو، یادی ڕۆژانی ڕابردومان بەراورد دەکرد.. ئەوەندەمان خۆشیو ناخۆشی بەسەر دلّو مێشکدا تێ دەپەڕی کە وەك دەروێشەکانی چیرۆکی کۆن دەگریاینو پێدەکەنین، گریانمان بەپێکەنین سواغ دەدا. یاخود بلّێین زۆر زۆر پیّ دەکەنینو قاقا دەگریاین. شەوگار شەق دەبو، لەبێداری بێزار دەبوم باوێشك دەمیان کەزێك پیّ دادەچەقاندم بەوەنەوزو وردەوێژینگانەوە دە بیرەخەو رادەچوم وە دەلێفەشڕەکەم دەخزامو دەمەویست سەرخەوێك بشکێنمو شەکەتیو گفتیم نەمێنیّ. ئەو تازە وەخۆ دەکەوت: چوار مێردەکی لەسەر تەختە بێبەختەکەی بەپانەوە دادەنیشت، کاغەزو قەلّەمی سەر کۆشی دادەنا، کەولّە تیسکنەکەی بەخۆدا دەدا. ملی خوارو سەری زلو شانو کەولّی کە سێبەریان دەخستە سەردیوار، ئەو شەولەبانو غولی بیابانەی وەبیر دێنامەوە کە دایکم بەساوایی لیّ ترساندبوم...



هەژار . هیمن




دیاره من لێم نەدەپرسی چدەکەی؟ ئەویش نەی دەگوت چدەکەم.. بەڵام دەم دی: شەرەفنامەی فارسی و عەرەبی لەدەوری خۆی دادەنان و لەبەریەکی ڕادەنان.

بەبڕوای هەمو کوردی زانێکی لەراستی نزیك و لەشەڕە گەڕەك بەدور تەنانەت بەبڕوای زۆربەی ڕۆژهەلات ناسان ڕۆژاواییش لەناو زاراوەی سۆرانیا شێوەی موکوریان لەهەموان پاك و ڕەوانتر ماوە وشەو ڕاوێژی دەمی بێگانەی زۆر کەمتر تێ خزاوە. لەناو موکریانیشدا ناوچەی بۆکان لەو بارەوە سەرتۆپە... هەژار موکریانی‌یەو سەر بەناوچەی بۆکانەو منداڵی ئەو ناوە هێشتا سەریان لە هێلکە نەجولاوەتەوە لەکوردی‌دا بلبلن و زمانیان هەتا بڵێی ڕەوانە...

بابی هەژار زانا و کوردپەرست بو، هەمو کوردستان گەڕابو، کرمانجی و سۆرانی زۆرباش دەزانی و لەئەدەبی کوردی و فارسی و عەرەبی و تورکی‌دا دەستێکی باڵای هەبو... هەژار لەسەر کۆشی ئەو بابە زمانی گرتوەو قسەی خۆش فێر بوەو دڵ و مێشکی بەشیعرو چیرۆکی کوردی ڕاهاتوە...

لەدێ گورەبوە، دەگەڵ منداڵان بەو کوردی‌یە بێ گەردو ساکارە دواوە. دەگەڵ کیژۆڵان دا لەوبەری چیاوە باللۆرەیان بۆ یەکتر هەڵداوە. شەرە جنێوو فڕپێك دادان و تەوس و پلارو توانجی پیرێژنانی بیستوە.. شەوانە بەلایەلایەی دایکە کوردی موکوریانی دەخەو ڕاچوە، بەیانی بەورینگە ورینگی دڵ تەزێنی کیژە کوردی مەشکەژێن وەئاگا هاتوە.. لە مزگەوتی لادێ: بەیت و لاوك و حەیران و گەلۆو شەوو نیوەشەوو درکانەو ئازیزەو پایزەو سوارۆ، گوێچکەیان ئاوداوە...)




## لەمێروله بەزی

"هێمن" ئەو بولبولە سەر بێتوکە
چۆنە لێی نایە چجوکەو نوکە؟!ء
کوانێ ئەوسینگە کە "ماژینۆ"بوو.؟؟
سەر لەمەیدانی نەبەردا گۆ بوو..!
وەکو بیستومە لە مێرولەی بەزی
دڵی وا گەرم و گوڕی سەیرە تەزی.!
کوا تفەنگی دەس و راوی کامە.؟!
گۆشە گیری چیە ئاغای دامە
بۆ دژەو ئەژنۆ دەباوەش دەگری
یان بەسەربەرزی بژی یان: بمری.!

*لە (هەژارانە)دا بلاوکراوەتەوە

# لەگەڵ شاعیری گەورەمان لە تووڕە بوونە ڕەواکەیدا

نووسینی: پیرۆت
وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا زەنگەنە

هەمووومان دەزانین ژمارە (1)ی (خەبات) لە1959/4/4دا بڵاوکراوەتەوە، سەرەتا (5) ژمارەی بەزمانی کوردی دەرچووە، دواتر ناوەناوە چەند ژمارەیەك بەکوردیو عەرەبی یەك بەدوای یەك هاتوون، تاژمارە (112)ی هەروا بووە، دواتر وادیارە (پارتی) بە باشی زانیوە ڕۆژنامەکە بە تەنیا بەزمانی عەرەبی بڵاو بکرێتەوەو زۆرتر بایەخی پێ دراوەو کادیرە پێشکەوتووەکانی تیایدا نووسیویانە، لەوانە (پیرۆت) گۆشەیەکی هەبووە سەرنجی خوێنەرانی ڕۆژنامەکەو ڕۆشنبیرانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوەو ڕۆژنا ڕۆژ یان هەفتانە گفتوگۆی لەسەر زۆر گرفتی ڕۆژانەو کێشەی هەنوکەیی کردووە، جاروباریش هەندێ بیرەوەری خۆی تۆمار کردووە.

من پێم وایە ئەم گۆشەیە یەکەم جار لەژمارە (147)ی ڕۆژی یەکشەمەی 17ی کانونی دووەمی 1960 بەبێ ئیمزا خاوەنەکەی دەس بەبڵاوکردنەوەی کراوەو بابەتەکەی بەناونیشانی (نامەیەك لەدۆستێکەوە) بووە، لەژمارەی دواتر بەناونیشانی (برا مەسیحیەکانمان) باسی گرفتی دیانەکانی کوردستانی کردووەو ئیمزای (پ)ی لەدامێنی بابەتەکەی داناوە، دوای چەند ژمارەیەکی ڕۆژنامەکە، نووسەر ئیمزای (پیرۆت) لەدامێنی بابەتەکانی گۆشەکەی داناوەو کۆمەڵێك بیرو بۆچوونی خۆی لەبارەی چەند باسێکی کۆمەڵایەتیو سیاسیو ئەدەبیو کولتوری تۆمار کردووەو چارەی بۆ داناون لەوانە:

-ئەوەی یەك لەبرا لاوەکان پێی گوتم
-نموونەیەك لەپەروەردەی تۆرانی
-لەڕۆژی لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکە
-دوورووەکان
-دەرسێك لەعلیۆنەوە
-زۆیا
-بارزان فرمێسکی دێتە خوارەوە
-دەمرین تا کوردستان بژی
-ئافرەتێکی کوربایی وانەیەکی لەوخەباتی ڕزگاریخوازیی پێ دام
-بەرگری لە حاجی قادری کۆیی
-نامەیەك بۆ مامۆستا عەبدولمەجید لوتفی
-بەڕێز جەنابی وەزیر من تۆ دەکەمە حەکەم

دیارە (هەژار)یش شوێنو پایەی تایبەتی خۆی لەلای (پیرۆت) هەبووە کەئەوسا ئەندامی مەکتەبی سیاسی (پارتی) بووە، بۆیە نووسەر لەژمارە (216)ی ڕێکەوتی 1960/5/14 دا بەم شێوەیە لەژێر ناونیشانی (مع شاعرنا الكبير في غضبته المشروعة) بەم شێوەیە بەرگری لەهەژار کردووە، لەوانەیە (نەوەی نوێ) زۆربەیان نەیانزانیبێ کە (پیرۆت) ئیمزای بەڕێز (مام جەلال) بووە.

عەبدوڵڵا زەنگەنە

*       *       *

(هەژار)ی شاعیری گەورەی کوردستان لەم ڕۆژانەدا زۆر تووڕەیە، لەکاتێکدا کە لەگەڵ یەکێك لە برا خەباتگێڕەکانم چووینە دیدەنی لەدووکانە بچکۆلەکەیدا بیبینم، ئەو کتێبەی دوای ماندووبوونێکی زۆرو دوای چەند ساڵ ماندووبوون[1] ئینجا توانیویەتی لە شێوەزاری کرمانجی بیگۆڕێت بۆ سۆرانی، وانەفرۆشراوەو ئێستا بە کەڵەکەکراوی ماوەتەوە، ئەو کتێبە شیعرەکانی -مەمو زین-ە کە بەجوانترین شاکاری ئەدەبی کوردی دادەنرێ، جگە لەوەش کتێبێکە پڕ لە دێڕە شیعری خۆشەویستی بۆ نیشتمانو نەتەوەی کوردو پێدا هەڵگوتنی جوانی کوردستانو دڵڕفێنی چیاو دۆڵو ڕەوشتی کیژۆڵانیو باسی ئەو دابو نەریتانە دەکات کە لەم وڵاتەدا باون، ئەم کتێبە هیچ کوردێکی خوێندەواری بەشەرەف دەستبەرداری نابێتو تەنیا بڵاوکردنەوەو گۆڕینی ئەو کتێبە بەشدارییەکی بەنرخە بۆ خزمەتکردنی ئەدەبی کوردیو مەسەلەی یەکخستنی شێوەزارەکانی زمانی کوردی.



خوێنەری ئازیز: لێت ناشارمەوە کە ئەو تووڕەییەی شاعیری گەورەمان تووشی کتوپڕییەکی کردمو سەرسامی دایگرتم کاتێ زانیم ئەوانە کێن کە شاعیر لێیان تووڕە بووە، چونکە ئەو شاعیرە

بەرزەمان واناسراوە کە زۆر کەم تووڕە دەبێت و ڕووداوەکان زۆر ژیرانە لێك دەداتەوە.

بەرامبەر بەدەردەسەری و ناخۆشی زۆر بەتوانایە، ئەوەندە بە ئارام و لەسەر خۆیە هەر شایانی ئەوەیە بگێردرێتەوە، لەناخۆشترین و مەترسیدارترین کات و گەرمەی ترس دا ئەو رووی خۆشە و زەردەخەنە لەسەر لێوی نابڕێ، شاعیرمان باوەڕی بەوە هەیە کە ژیان خەبات و تێکۆشانە لەپێناوی گەل و نیشتمان و هەرواش تێی گەیشتووە، ئەو کوردستانەکەی زۆر خۆش دەوێ، ئەو خۆشەویستیەشی وەکو عیشقێکی سۆفیانەیە، چاکم لەبیرە کە لە شەوێکی پایز ئەو قسەیەی پێ گوتوم.. لەوکاتەدا کە ماڵەکەی لەگوندێکی کوردی کوردستانی بەسوریە لکێنراو بوو، ئەوەندە دەست کورت و نەدار بوو کە بارگرانیی دەخستە سەر شانی هەموومرۆڤێك، چ جای شاعیرێکی نەخۆشی هەست ناسك بەتایبەتی کە ئەوسا تازە لەگەشتێکی ئەورووپای گەڕابۆوە کە بەمەبەستی بەشداری کردن لە میهرەجانی لاوان و قوتابیان لەمۆسکو چوو بوو، بەڵام هەندێك لایەنی سووری و عێراقی لێنەگەڕابوون ئەو ئاواتەی بێتەدی، بۆیە لەسەر شەقام و جادەکان کەوتبوو لەو گەشتەیدا دووچاری نەبوونی و نەداری و برسێتی ببوو کە ئەمەیش هیچ شەرەفێك بەوانە نابەخشێ کە ڕێگەیان لێ گرتبوو و نەیانهێشتبوو[2] بگاتە ئەو میهرەجانە! لەو کاتەدا کە لەگەڵ شاعیر بەیەکەوە قسەمان دەکرد و باسی ئاڵۆزی و کێشەکانی کوردایەتیمان دەکرد، دیاربوو چەند کوردستانی خۆش دەویست کە هەندێك ئەو هەست و نەستەی بەنادروستی لێك دەدەنەوە. ئەو ئەوەندە کوردستانی خۆش دەوێت خۆی و ماڵ و منداڵەکانیشی بۆ دەکاتە قوربانی و کەسیش ناتوانێ ڕێی پێ بگرێ.

دیاربوو لەبەر خۆیەوە پێکەنی و گوتی: دەتوخوا وازیان لێ بێنە با ئەو خۆشەویستییەی من بۆ نیشتمانی کوردستان وەکو خۆشەویستییەکەی سۆفیان بەراورد بکەن، چ لەوە باشترە مرۆڤ ئاشقی وڵاتەکەی خۆی بێت و خۆی بۆ بکاتە قوربانی نەك بۆ نموونە، خۆشەویستی ئافرەتێك و مردن لەپێناویدا.[3]

خوێنەری بەڕێزم: ئالێرەدا دەبینم لەگەڵم کۆك دەبی ئەگەر بزانی ئەوانەی ئەو لێیان تووڕەیە هەر ڕۆڵەکانی کوردستانی ئازیزن. کەشاعیرمان بەسەرو ماڵی خۆی درێغی بۆ نەکردوون، شاعیرمان لەخەباتی دوورو درێژی نیشتمانیدا ئەوەندە دەربەدەری و هەژاری و نەخۆشی و کلۆڵی دیوە بە چەند بەرگە کتێب هەر باسی ناکرێ، کەچی ئەو زۆر بەئارامی و لەسەر خۆ بەرگەی گرتووە و هەر رووی خۆش بووە، لێنەگەڕاوە بۆ چرکەیەك بێ وورەیی و ڕەشبینی خۆیان بخزێننە ناو دڵە گەورەکەی کە پڕە لە خۆشەویستی کورد و کوردستان و، بێزیی نەهاتووە خۆی بداتە دەست چارەنووس و بەسەریشیدا زاڵ بووە، تەنیا بۆ چرکەیەکیش نەیویستووە دەست لەسەربەرزی و ڕەوشت و خووە بەرزەکەی خۆی هەڵبگرێ، تەنانەت لەو کاتانەشدا کە لەناو نوێنی مردن دا بووە ئەو، جگە لە حزب و ئەندامەکانی، یارمەتی لەکەسی دیکە قبوڵ نەکردووە. ئەوەندەی ئیشی پێ بکرابا هەر لەکرێکاری چێشتخانەوە تا گسکدەری و وێنەگەریتی، هەموو جۆرە ئیشێکی دەکرد، ئەوەندەی بەس بوو زگی خۆی تێر بکردبا و دەستی خۆی لەبەر کەس پان نەکردبایەوە.

ئەو شاعیرە شۆڕشگێڕەی کوردستانم لەهەموو بارو زروفێکی ناخۆشی و نەبوونیدا دیوە، هەر وورە و گەشبینی و باوەڕ بەخۆبوونم لەچاوەکانی خوێندۆتەوە، بڕوای بە ڕەوایەتی کێشەی گەلەکەی و سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسەر ئیمپریالیزم و زۆرداران هەبوو، کەواتە ئایا ئێستا هەقی خۆم نییە ەم لەم تووڕە بوونەی سوڕ بمێنێ و لام سەیر بێ؟ بەڵام دواجار بینیم ئەو لەسەر هەقە و تووڕە بوونەکەی ڕەوایە، خوێندەواری کورد چۆن شەرم لەخۆی ناکاتەوە! لەکاتێکدا هەندێکیان چنگە دینارێك بە چەند سەعاتێك لەسەر مێزی خواردن و خواردنەوە بەفیڕۆ دەدەن؟ یان چۆن خوێندەواری کورد شەرم لەخۆی ناکاتەوە کاتێك دەزانێ شاعیرێکی هەژاری گەورەمان لەدەمی منداڵی خۆی دەگرێتەوە چەندان شەونخونی دەچێژێ تا کیتابێك بە قەرزو قۆڵە چاپ بکات؟

کەچی خوێنەرش دانەیەکی لێ نەکڕیبێ. بەڕاستی شاعیری گەورەمان هەقیەتی تووڕە بێ. ئامۆژگاری خوێنەران دەکەم هەر کەسەو بابچێ دانەیەك لەم کتێبە بکڕێ و هیچی نەیەڵنەوە.

## پەراوێز

(1) هەژار لەبارەی چاپەکەی –مەم و زین– لە ل350ی چێشتی مجێور نووسیویە: کەمن ڕۆ ییبووم بۆ روسیە، بارزانی بە زەبێحی گوتبوو: "حیسابی بکە چاپی مەم و زین چەندی تێدەچی بتدەمێ"

حیسابی کردبوو، سەت و بیست دیناری وەرگرتبوو، تامن هاتمەوە شێست و چوار سەفحە لەچاپ دراوە، پولیش خەلاس ببوو، پێشەکیەکی بۆ نووسیبوو، زۆر جوان بوو بەڵام نووسیبووی خانی لاسایی مەجنون و لەیلای نیزامی کردۆتەوە، بەوە ڕازی نەبووم، لەیلەو مەجنونم لەسەر ڕا خوێندەوە، هەر کەس هەردووکان لەبەریەك رابگرێ دەزانێ خانی زۆر بەهێزتر لە نیزامی ئەو بەیتی گوتوە، دیارە خانی حەوسەرد سال لەدوای نیزامی هاتۆتە دنیاو ئەدەبیات ڕێگەیەکی زۆری بەرەو چاك بوون بڕیوە.

مەم و زینم چاپ کرد و شێست و شەش دینارم لەسەر دانا، چوار سەد دانەیەکم بەدیاری دا بەئاشنایان. دووسەتێکم دا بەو ئێرانیانە کە لە سولەیمانی کۆمونەیان هەبوو: کە گوتیان لەڕۆژێکی ترس و لەرزا حەمامیان پێی گەرم کردبوو!!" ئەوی تریش لەسەتا حەفتای کتێب فرۆشان خوردیان و لە عەسلی مایە چل دیناری خۆشم زەرەر کرد.

(2) ئەو گەشتەی شاعیر لەتەك عەبدولرەحمان زەبێحی و سینەم جەلادەت بەدرخان بووە، هەژار لە ل254–271 ی کتێبەکەی چێشتی مجێور باسی ئەم گەشتەی خۆی کردووە.

کە ئەم وەندە کوردیە کەئەوانی بە تەمابوون لەمۆسکۆ پەیوەندی پێوە بکەن بەسەرۆکایەتی مام جەلال بووە، ئەو کەسەش کە لێی تێکداون و نەیهێشتووە بگەنە شوێنی مەبەست ئەو خالید بەگداشری بەرەسەن کوردی حیزبی شیوعی سووری بووە.

(3) ئەو دیدەنیەی هەژارو مام جەلال لەکاتی خۆ ئامادەکردن بووە کە بەتەمابوون بچنە مۆسکۆ.

# موناجاتی هەژار

عەبدوڵڵا زەنگەنە.

کارخاندی قەندی، یا سلسلەی شاهی نەقشبەندی ئەم شیعرەی هەژار بە دووبەش لە هەردوو ژمارە 102ی نیسان‌و 103ی مایسی 1961 لە ڕۆژنامەی کوردستان–ی تاران بلأوکرابووەوە. من کاتی خۆی، لە ساڵیادی ڕۆژنامەنووسیی کوردیدا لە هەولێر بەشی دووەمی شیعرەکەم لەبەر ئەو ژمارەیە نووسیبووەوە کە مامۆستا حەمد کەریم هەورامی بۆی هێنابووم تا لەو پێشانگای ڕۆژنامەنووسییە پیشانی ئامادەبووانی بدەم کە بەبۆنەی سەد ساڵەوە لەگەڵ مەحمود زامدار بە هاوبەش کردبوومانەوە، دواتر کە ئەم ژمارەیەی ڕۆژنامەکەو کۆمەڵێکی دیکەشی بوونە مولکی کاك ممتاز حەیدەری بەشی یەکەمی شیعرەکەشم نووسییەوە کە لە ژێر ئەم ناونیشانەی سەرەوە لە دوتوێی ڕۆژنامەکە نووسرابوو:

" هۆنەری بە ناوبانگی کورد هەژار رازو نیاز لە بارەگای یەزدانی تەوانا دەکات، وە دەسەوداوێنی طەریقەتی نەقشبەندی دەبێت، وە لەسەر سلسلەی طەریقەت‌و شەریعەت‌و پێشەواو ڕابەری عالەمی بەشەرییەوە حەزرەتی ( محمد المصطفی صلی‌الله علیە وسلم" دەس پێ بلأوی نەکردۆتەوە، منیش ئەوسا ئەوەندە میانەم لەگەڵ ئەو مامۆستایە نەبوو، دووەم جارم بوو دەچوومە خزمەتی، بۆیە هیچ قسەیەکم نەگوت‌و شەرم گرتمی‌و یەکسەر هەستام‌و بەجێم هێشت، دواتر هەر بیرم دەکردەوەو لە خۆم دەپرسی: تۆ بڵێی من هەڵە بووبم‌و شیعری هەژارم پێ نەناسرابێتەوە؟ تۆ بڵێی ئەو (هەژار)ە شاعیرێکی دیکە بووبێ‌و من لێم تێك چووبێ؟ بە تایبەتی ئەوسا هەژار لە عیراق بووەو کۆڕو کۆمەڵەکانی سیاسی لە عیراق ئەوەندە هەوەستیان بەم ڕۆژنامەی کوردستان–ی تاران نەدەهات‌و لە خۆم دەپرسی: دەبێ هەژار خۆی ئەم شبعرەی بۆ ڕۆژنامەکە ناردبێ؟ دوای بلأوبوونەوەی دیوانەکەی هەژار دیار بوو ئەمشیعرەی تێدا نەبوو، ریکەوت وابوو دواتر کتێبەکەی" چێشتی مجێور" یان بۆ هێنامەوە کە ماوەیەك بوو لای برادەرێك بوو، ئەمجارە بە ووردی کەوتمە خوێندنەوەی دەبینم لە ل 87دا هەژار خۆی نووسیویە:

" ناوی مەشایخی نەخشبەندیم بە شیعر هۆنیبۆوە، دووەم‌و سێیەمی بیبلیۆگرافیاکەیمان لە ژمارە( 8)و (9)ی بەهارو هاوینی 2002 لە گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی) بلأوکردەوە، دەرکەوت ئەویش هیچ ئاماژەیەکی بۆ ئەم شیعرانە نەکردووەو سەرنجی ڕانەکێشاوە، بۆیە ناچار بووم داوا لە مامۆستا (فەرهاد) بکەم بۆ ماوەیەك بەرگەکانی



ڕۆژنامەکەم بخاتە بەردەست دەبینم لەژمارە 106ی ساڵی سێیەمی 24ی مایسی 1961 دەقی نامەیەکی( هێمن)ی بلأوکردۆتەوە، هەموو پەسەنی ئەم شیعرەیەو تیایدا دەڵێ:

" کارخانەی قەندی، یا سلسلەی مەشایخی نەقشبەندی یەکیکە لە جوانترین، بەکەڵکترین، پڕ ئیحساسترین ئاثاری هەژار، تەنانەت دەتوانم بڵێم بە شاکاری وێژەی کوردی دەناسری، بلأوبوونەوەی ئەو هەڵبەستە کە کەمە کەمە لە بیرمان دەچوەوە، سوودی زۆر گەورەی لێ وەردەگیری. ئەو هەڵبەستە بێجگە لەوەی کە لە چاو عیرفانەوە ئەرکێکی بەرزو بێوێنەیە، لە چاو کۆمەلأیەتی‌یەوەش دەتوانین بەهرەی زۆری لێ وەرگرین" پاشان " هێمن" لە سێ خاڵدا بە کورتی سوودی کۆمەلأیەتی ئەو شیعرەی خستۆتە بەر چاوان‌و برگری لە هەژار کردووە کە شاعرێکی بێ دین نەبووە"

ئیلاهی! تۆ بەذاتی ذولجەلالت
خودا! تۆبی‌و صفاتی بێ مثالت
بە حەققی ئەو کەسەی فەرمووتە:" لولاك"
نەبوو مەطلەب کە بیکەم خەلقی ئەفلاك
حەبیبەو مەحرەمی سڕڕی نیهانت
" محمد" خاتەمی پێغەمبەرانت (ص)
" رسل" ئەستێرەن‌و ئەو ئافتابە
لە عوقبا بۆ شەفاعەت ئەو حیسابە
کە بێتە بەخشش ئەو دەریای جوودە
پریشکێکی بەسە هەرچی وجوودە
بە موعجیز وەختی ظاهیرکردنی حەق
ئیشارییێکی لە مانگی کردو بوو شەق
هەموو ئاحادی ئەوصافی کردووە
سەهوم کرد یا"رسوالله" ببوورە
بە ذەیلی وەصفی تۆ ناگا دەسی کەس
سزای تۆ، نەعتی تۆ، قورئان دەڵێ‌و بەس
بە فەضلی حەضرەتی"بوبەکر صدیق"

که ئەفضەل پاش نەبیی، ئەوبوو بە تەحقیق
هەموو ئیمانی ئوممەت نزمو بەرزی
کەفەی ئیمانی هەڵنابڕن لە عەرزی
کە دۆخی شیری بۆ کوفریٚ نەباسەد
کەمی مابوو، موسوڵمان ببنە مورتەد
ئەوە "ثانی اثنین" یاری غار ئەو
لە ڕێی جانی جیهاندا، جان نثار ئەو
بە روشدی حەزرەتی مەحبووبی وەهاب
خەلیفەی ثانی، یەعنی "ابن خطاب"
خەلافەت بوو بە تەشریفی "عمر" نەو
عەبایێ بوو عەدالەت هاتە بەر ئەو
لەسەر باش گەر نەبوو ئەحکامی جاری
ندایی "الجبل" چۆن گەییە" ساری"
دەفەرمووێ ئەو کەسی" خیر البشر" بوو
لە دووی من گەر نەبی بووبا"عمر" بوو
بە ئازەرەو حەیای"عثمان"ی عەفان
تنۆکێکو لەوی دەریای "عمان"
بە سەعیو هیممەتی، قورئانی کۆکرد
ڕێگای دین ببینی تەخت بیٚ کڵۆکرد
لە رۆح بوورد، نەك لە قورئان بەسیە تەعریف
"فسیکفیکهم" بۆی بەستە تەشریف
بە حەققی دەرکی شاری عیلمو جەوهەر
"علی " موشکڵ گوشایی دەرکی خەیبەر
"نەبی " فەرمووی: کەسیٚ مەولای ئەمن بم
ئومێدی بۆ تکای ئەولا ئەمن بم
دەبیٚ حوببی"علی " جیٚ کا لە دڵدا
بەسەر دڵ دەرکی بوغضی ئەو قفڵ دا
بە حەققی حەزرەتی"سلمان" و"قاسم"
کە هەردووکیان بە دۆستی تۆ دەناسم
لە ئالی" مصطفی" مەعدوودە"سلمان"
لەوی٘دا بوو پەیا، قەدرو محەلمان
نەوەی"بووبەکر"ە "قاسم" سەر طەریقە
یەمی فەضلی گەڵیٚ پانو عەمیقە
بە سەیدانی جحێڵانی بەهەشتت
ئومێدو دۆستی ئەهلی حەوتو هەشت
بە تێبینی لە دینو خەیر خواهیی
" حسن" بەر پیٚ لەقەی دا، تەختی شاهی
" حسین" مەظڵومی دەشتی" کەربەلا" بوو
لەسەر موڵکی شەهادەت،پادشا بوو
بە ترسی ڕێگەیی هاتو نەهاتم
دەغیل! ئەی رۆڵەیی شیرینی" فاطم"
خوداوەندا، بە"زین العابدین"ت
بە وەروون، زەینی ئەهلی سەر زەمینت
" علی" رۆڵەی" حسین" قوطبی مەدار ئەو
لەسەر صەفحەی جنان نەقشو نگار ئەو
بە حەققی کێوو بەحری فەضلو ئیحسان
کە بۆ چاوی هەموو ئینسانە، ئینسان
دەری خست" باقری " کوفرو ضەلالەت
" امام باقر" گوڵی باغی رسالەت
بە حەققی"جعفر"ی مەصدوقو صادق
لە عیلمی دووکەون، پڕ دەستو فایق
نە" جعفر" بەحری عیلمو قولزومی جوود
بە خامە ناکریٚ ئەوصافی مەعدوود
بە حەققی ئالو بەیتی پاكو خاوێن
کە ئالوودە نەیان بوو، چاكو داوێن
لە داوای دین بە مەردی چوونە سەنگەر
وەکوو کەشتی لە هەردی بوونە لەنگەر
بە" والّیی" ئەولیا، دڵ قولزمی نوور
لە ڕاحی عیشقی تۆ سەرمەستو مەخموور
طەریقەت " بایزید" کردوویە مەعموور
شەهی مولکی" فنا فی اللهی" "طیفور"
بە نوورە بەدری" خەرقان"، "بوالحسن" بەو
سەرای ذکری خەفیی پڕ بوو لە پەرتە
بە فەضلی "بوعلی" قوطبی یەگانە
بحاری فەضلی نا پەیدا کەرانە
بە"خواجە یوسف" ئەلوەندی حەقیقەت
بناوان هەڵگری بەندی طەریقەت
بە "عبد الخالق"ی، خواناسی فانی
لە نێو عالەم شەهیدە "غجدوانی"
بە عومری روویی کوللی ساعەتو تاو
بە دووی پیغەمبەرا هەنگاو بە هەنگاو
بە" خواجە عارف"ی عارف_ ئەسرار
بە" محمود"ی گەلی پیرانی ئەبرار
بە" جۆلاّی" تاروپۆی خاوەن تەمیزان
عەزیزی لای خودا، پیری عەزیزان
بە حەققی حەزرەتی" بابانی سماسی"
طەریقەت بوو بەوی مەحکەم ئەساسی
بە ئاوێنەی دڵی" سید کلال"ت
لەوێدا دەینواند صونعی جەلالت
بە شێخی ئینسو جننی قوطبی "لاهوور"
رەوا بوو حوکمی بۆ سەر ئەختەرو نوور
سەری هەودای طەریق پاکی بەوی بوو

گەمێ وانی بحاری عارفی بوو
ئەوە مەرکەز، مەشایخ حەلقەیی دەور
وەلیی سەوزە گیا، ئەو بارش‌و هەور
هەڵی کرد بۆ طەریق ڕووناکترین شەم
لەو ئەولادی "حسن"بوو "غەوثی ئەعضەم"
بەحەققی پیری پیرانی "بوخارا"
بوزورگیی زۆرە ناگونجێ لە زارا
شاهەنشاهی سەریری نەقشبەندی
بەسەرهەچی لە شەئنی دابوو، سەندی
دەڵێ: هەر کەس لە هەرچی دڵغەمینە
لە من داوا بکا، ئەسپم بەزینە
لە ئەنفاسی "علاءالدین"ی، دڵسۆز
لەسەر فەرشی، طەریقەی، ڕادەدا تۆز
بەحەققی حەزرەتی "یعقوبی ئانی"
کە "چەرخی" پێ ئەڵێن، چەرخەمەکانی
بەناڵینی "عبیدالله اطرار"
لە دەرکی کبریات ئامال‌و ئەبکار
زمان مەدحی بکا، شێت‌و نەزانە
نەزیلەی ئاسمان‌و ڕێسمانە
بەحەققی "تارك الدينا"ی موجاهید
غەواصی بەحری عرفان "خواجە زاهد"
بەدەروێشی مەولانای "دەروێش"
لە فەیض‌و ڕەحمەتت بێ حەد، دەچوو پێش
بەسۆزی "خواجەگی"و ڕازونییازی
بەعیشقت بوو لە مەشقی ڕۆح بازی
بەمەستی ساغری صەهبای "الستی"
زەمانە وەك نقیمی بوو لە دەستی
ولایەت شاهدە ئەو ببووە ڕەواتی
لە مەوجی عیشق خانی "خواجە باقی"
بەسەردار عێلی خێڵی خوداشناسان
نەفس بوو لەو بەرەنج‌و دێو هەراسان
کە دی تینوو زەوی قەڵبی هونەروەر
لەرێ ناسین‌و ئیجرای شەرعی ئەنوەر
بەهۆی شانی لە دەریایی مەعانی
هەڵی‌بەست جۆگەیێك بۆ ئەلفی ثانی
لەوە ئاوی بەشەرعی "مصطفی"دا
جیهانی ڕەونەق‌و باغی صەفادا
بەدڵ تینووی طەریقەت فەیضی بەخشی
هەزاران ئافەرین ئاودێری نەخشی
سەری هێند سەروەرانی بۆ بووە خەم
بە "سەر هیندیی" بووە مەشهووری عالەم
کە "ڕەبانیی" ئەوە ئیتر زمانم
بەوەصفی چوون دەگا نوطقی بەیانم
بەنووری چاوی ئەو "مەعصوم" کە نووری
هەبوو شەوقی لە نێزیك‌و لە دووری
بە "شێخ عبدالاحد" نەجمی درەخشان
"محمد عابد"ت لەعلی بەدەخشان
بەشمشێری دەبانی دین طەڵەب کار
کە "سیف الدين" جەوهەری ناغار
بەینووری عالەم ئەفرۆزی "سیدنور"
وەلی بەم نوورە بۆ عالەم دەکەن سوور
بەحەققی مەظهەری لوطف‌و عینایەت
بە (مظهەری شا" شەهی تەختی ولایەت
بەشا بەیتی قەصیدەی خواپەرستی
نەشەبەخشی شەرابی عێشق‌ومەستی
کە شەو بوو ڕۆژی هیندوستان‌و ئەهلی
هەڵات ڕۆژی جیهان ئابادی دهلی
حەکاکی کرد ئەوی بوو عینزو جاهی
لەسەر دڵ ناوی "عبدالله" شاهی
بەنووری شەوچرای شامی غەریبان
بەسەرووی باغ‌و گوڵزاری حەبیبات
کە سەردەستەی هەموو مەستانە "خالد"
نەمامی باغی کوردستانە خالد
فیداتم نیشتمان بۆ شارەزوورت
ڕووناکە شام‌و ئەستەمبوول بەنوورت
بە "عبدالله"و "طه" پیری شەمزین
لە داوای دین نەماندوو بوون نەشەمزین
شەمسی دڵ بوون‌و زینی مەحفەلی دین
وەتەن شادبینی تۆ ئەو دوو کوڕەت دین
بەحەققی حورمەتی "عثمان"ی ئانی
کە فەصلی ئەو مەگەر بۆ خۆت بزانی
"معطر" بوو لەوی ڕاقاف هەتا قاف
چ باغێك دی، گوڵی واجوان‌و شەففاف
دەسی قودرەت بەفەییاضی چەقاندی
هەوای صافی تەوێڵە پەروەراندی
بەحەققی گەوهەری یەکتای بەهادار
"بهاءالدين محمد" دڵ پڕ ئەنوار
فرەی‌دا هەر شتێ چەوت‌و چەوێڵە
موضاعەف زیادی‌کرد نرخی تەوێڵە
بەشەهبازی طەریقی نەقشبەندی
برووزی‌دا، لە عیشقا مەردوورەندی
کە کانی‌و مەعدەنی صدق‌و صەفا بوو

له زامی دڵ شفا بوو "بوالوفا" بوو
بەحەققی خادمی شەرعو کەلامت
گزیدەی ئەولیایانی کرامت
بوزەرگە زیاد لە ئەندازەو لە تەخمین
"ضیاءالدین عمر" ضەوئی دڵو دین
بەچەشمەو مەنبەعی عیلمو سەعادەت
بەسیپارەی خوداناسیو عیبادەت
کە بازی بیری زانا بێتە پەرواز
بەپیرۆز ناوی ئەو چاوی دەکا باز
"حسام الدین علی" شیری دەسی دین
کلیلی نەگبەتیو خۆشی بەدەس وین
بەهاو ضەوئی چرای دین ڕەونەقی سەند
بەوو، دنیای فرێدراو ڕێ حەقی سەند
کە هەورامانییە طواغرای نەخشی
هەور ئامانی بوو هێند فەیضی بەخشی
بکە روحمی بەمن بەس روسیاهم
بدە دەورە سیاهی هەر گوناهم
بەفریادم بگە مەخشوشە حاڵم
بەخۆرایی صەرف بوو مانگو ساڵم
نەشێوی طەعەتێکم بۆ براوە
نەتۆوی چاکەیێکم بۆ چناوە
لە بەردم داوە شیشەی نامو دەنگم
لە خەرمانی عەمەل هەر با بەچەنگم
تەواوی عومری خۆم صەرفی هەوا کرد-
هەتا خۆم بابە چەنگو بێ نەواکرد
لە ناکاو هەر بینا وەختی سەفەرهات
ئەوی لێ غافڵم گورحم بەسەرهات
عبوورم چۆن دەبێ من لەو سنوورە
کە تێشوو لازمە لەو ڕێگە دوورە
نییە تێشووم لە ڕێگا یامزلگاه
مەگەر "لاتقنطوا من رحمة الله"
گەداێیکم لە دەرکی کبریاییت
ئەمن موفلس ئەتۆیش خۆتو خوداییب
بەمستە خۆڵە مێشکم جەهەننەم
نەتۆزێ زیاد، نەیەك زڕڕە دەبێ کەم
بکە روحم، ئەرحەمی زومرەی روحم بەر
لە دەرکی تۆ بەدەر، نیمەیە ناو دەر
کە بێ ئەنوا لە دەستی مەحشەرابم
لە عەفوت دا، طوفەیلی ئەولیا، بم
ئیتر من هەر بەوە ئوممێدەوارم
کە تۆ نێوت کەریمەو من "هەژارم"



# هەژاری گەورە لە بیرەوەریەکانی کەمال مەزهەردا

عەبدوڵلا زەنگەنە

فەرامۆشکردن و بەژێر لێوەوەکردنی هەر جۆرە رووداوێکی دیرۆکی رابردوو زوڵمێکی گەورەیە لە مێژووو زانستی مێژوو کراوە، لە نێو رووداوەکانی رۆژگاریش دا نموونەو بەڵگە لەسەر ئەو بۆچوونانە زۆرو زەوەندەیەت کە پێی وایە زۆر کەم وابووە راستییەکان تاسەر شاردراوە بن، لە نێو رۆژگاری مێژووی مرۆڤایەتیدا زۆر رووداوی دیکە هەن هۆی دیزە بەدەرخونەکردنیان ئەوە بووە ئەوانەی تیایدا بەشداربوون یان ئەوەتا نەیانتوانیوە بەباشی یەکدی بخوێننەوە، یان خۆپەسەندیو پەرژەوەند پەرستیان ئاستدنگ بووە لەبەردەم دەرخستنیدا، لە هەردوو ئەو حاڵەتانەشدا زۆربەی مرۆڤایەتی زەرەرمەند بووە، دیارە ئەوەش بەلای کەمیەوە هۆکاری هەبووە، ئەگەر دووەمیان زیاتر پەیوەندی بەناخ و دڵو دەروونی تاکە تاکەی مرۆڤەوە هەبوبێت، ئەوە هۆکاری یەکەمیان زیاتر پەیوەندی بەئاستی رۆشنبیریی ئەو توێژو لایەن و کەسانەوە هەبووە کە رێنمایی خەڵکیان کردووە.

ساڵەکانی کۆتایی شەستەکانی سەدەی بیستەم، هەرزەکارێك بووم، دەهات گەڕان و سووڕان بەدوای سەرچاوەکانی رۆشنبیری مێشك و دڵو دەروونم بتەنێتەوەو لەلام ببێتە خولیا، بەتایبەتی کەزۆرم باوەڕبەو حیکمەتە هەبوو کەدەڵێ: "من علمني حرفاً، ملكني دهراً." یان "صرت له عبداً". ئەوسا زۆر هات و چۆی ئەو شوێن و کەسانەم دەکرد کە سەرچاوەکانی ئەم بوارەیان لەبەردەستدا بوو، یەکێك لەوانە کتێبخانە بچکۆلەکەی ئەوسای مامۆستا عەزیز گەردی بوو، رۆژێکیان بیەکەوە لەماڵەکەیەوە بۆ بازاڕ دەرکەوتین، گوێم لێ بوو لەگەڵ یەکێك لەبرادەرەکانی باسی شاعیرێکی بێگانەی لەگەڵ دەکرد، بەڵام بەبیرم نەماوە سەر بەچ نەتەوەیێك بوو، دەیگوت لەپێشەکی کتێبێك دا نووسینێکم لەبارەی خوێندۆتەوە بەناونیشانی "الشاعر الرجعي العظيم" پەسنی کراوە، دیاربوو ئەو برادەرانە گوێیان لێیدەگرت ئەو بۆچوونەیان پێ هەزم نەدەکرا، بەتایبەتی ئەوسا نووسەرانی کورد شانازیان بەخۆیانەوە دەکرد کە ئەو توێژەی رۆشنبیرەی کوردان کۆنەپەرستییان لەنێودا نەبووە، بەهەرحاڵ لەوساوە تاوەکو ئەمڕۆ ئەم مشت و مڕەو ئەو ڕستەیەی نێو کتێبەکە لەلای من بەنەمری ماونەتەوەو لەوانەیە کەم کەس هەستیان پێی کردبێت کە لەژیانی رۆژانەشم دا رەنگی داوەتەوە کەپێم وابووە مرۆ بەردەوام دەبێ ڕێز لەبەرامبەرەکەی خۆی بگرێت، جا ئەو کەسە لەسەر هەر مەزەب و باوەڕێك بێت...! ماوەیەك بەر لەدەستپێکردنی ڤیستیڤاڵی هەژاری موکریانی، کە لە مانگی تەشرینی دووەمی 2002 لە هەولێر بەسترا، بەمەبەستی بانگهێشتکردنی هەندێ لەڕۆشنبیرانی بەغدا بۆ ئەو ڤیستیڤاڵە سەردانی مامۆستای بەڕێزم د.کەمال مزهەریشم کردو داوام لێی کرد ئەویش بەبابەتێك بەشدار بکات. لەگەرمەی باس و خواسی ڕۆشنبیریمان دا بووین، ئەو لەخۆیە هەلیدایێ و خۆزگەی ئەوەی خواست دەزگای سەردەم ژمارەیەکی (ڕۆڤار)ی بۆ (هەژار) تەرخان بکردبایە، دیاربوو منیش ناوی (حوزنی موکریانی)و (هەژاری موکریانی)و لا تێکەڵ ببوو بۆیە یەکسە گوتم: ناوی ئەویش لەریزبەندی ژمارەکانی داهاتووی (ڕۆڤار)دا هەیە، پاشان هەر خۆم لەوێ پەشیمان بوومەوەو داوای لێبوردنم کرد کەوا دیارە ناوی (حوزنی)و (هەژار)م لێ تیچك چووە، هەر لەوێدا دکتۆر هەرێی دا نامەیەك بۆ بەرپرسی دەزگای سەردەم بنووسێ و تیایدا داوای لێ بکات گوێ نەدەنە جیاوازی هەندێك بۆچوونی لابەلاو هەوڵ بدات یەك لەژمارەکانی ئەو بڵاوکراوەیان بۆ ئەو زاتەش تەرخان بکرێ. هەمووی سێ مانگی پێ نەچوو کەدوای سازدانی میهرەجانی (هەژار) لەهەولێر، ئەوەبوو ژمارە (22)ی (ڕۆڤار) بڵاوکرایەوەو تیایدا ناوی (هەژار)یش شوێنی خۆی لە ڕیزبەندی ژمارەکانی دواتر گرتبوو، ئەو هەڵوێستەی دەزگای سەردەم ئەو حیکمەتەی پتر لەچارەکە سەدەیەکی بەبیر هێنامەوە کە لەسەرەوە دەقەکەیم بۆ نووسیون، بۆیە سوپاسی خوام کرد کە ڕۆشنبیرانی نەتەوەکەی منیش وایان لێهاتووە بەرامبەرەکەی خۆیان بخوێننەوەو ڕێز لە حەزو ئارەزووەکانی یەکدی بگرن، بۆیە خۆم پێ نەگیراو بەبێ بیرکردنەوە خۆم هاوێشتە ژێر ئەو مەسئولیەتەی ئەو (ڕۆڤار)ەتان بۆ ئامادە بکەم، دیارە خۆزگەو تەمایەکەی د.کەمالیشم لەبیر نەکردبوو بۆیە جارێکی دیکە سەردانیم کردەوەو پیرۆزباییم لێی کرد وامەرامەکەی هاتۆتەدیو (ڕۆڤار)ی چەند مانگی داهاتوو لەبارەی (هەژار) دەبێ و منیش ئامادەی دەکەم و دەبێ ئەم جارە بەبابەتێك بەشداری تێدا بکەی، هەرچەندە دکتۆر دیاربوو پڕ کاربوو بەڵام گفتی دامێ هەرچۆنێك بێت ووتارێك لەژێر ئەو ناونیشانە بنووسی کە لێرەدا من کردوومەتە ناونیشانی ئەم ووتارەی خۆم، من پێم وایە ئەگەر هەڵگیرسانی ئەم جەنگی سێیەمەی کەنداو کەناونراوە "جەنگی ئازادی عێراق"، چەند ڕۆژێکی دیکە درەنگتر بقەومابووایە، لەوانە بوو ئێستا لێرەدا بابەتەکەی بخوێندرابوایەوە، کە لەوانە بوو کۆمەڵێك بیرەوەری تایبەتی و دانسقەی لە خۆبگرتبایە بە تایبەتی د.کەمال ماوەیەك لەگەڵ هەژار بەیەکەوە لەکۆڕی زانیاری کورد کاریان کردووەو بەیەکەوە سەردانی زۆر شوێنیان لەدەرەوە کردووەو بەم کارەی دەزگای سەردەم زۆر دڵخۆش بوو، زیاتریش لەبەرئەوە بوو بەبێ ئەوەی ئەو نامەکەی بۆ دەزگاکەی بنووسێ ئەوان خۆیان ئەم دەستپێشخەرییەیان کردووە.

دیارە لەگەڵ دامەزراندنی کۆمەڵەی (ژ.ك)و دەرچوونی بڵاوکراوەکەیان کە بەناوی "نیشتمان" بوو، لە ساڵی 1943ەوە



**دانیشتووەکان لە ڕاستەوە بۆ چەپ: د. کەمال مەزهەر، جەمیلە، هەژار، عەرەبی شەمۆ / راوەستاوەکان: خالدی چەتۆیف، جاسمی جەلیل، حاجی جوندی، شاکری خدۆ**

**ئێریڤان 1972**

(هەژار) چۆتە نێو جیهانی ڕۆشنبیریو ئەدەب، دەبێ بەدرێژایی ئەم ساڵانەو تا کۆچی دوایی لەساڵی 1991دا کۆمەڵێك بەرهەمی بەپێزو دانسقەی چاپ کردبێو کۆمەڵێکیشی بەدەستنووسی مابنەوە. لێرەدا هەر ئەوەندە دەکرێ بە پەلە بیبلیوگرافیایەك بەناوی بەرهەمەکانی بنووسمەوە:

1–ئاڵەکۆك (شیعر) 1325ی هەتاوی (1946)، تەورێز. ئەم بەرهەمەی جارێکی دیکە لەساڵی 2001دا لەهەولێر بڵاوکراوەتەوە، بەبێ ئەوەی ئیمزای هیچ دەزگاو کەسێکی لەسەر نەبێت.

2–کارخانەی قەندی سیلسیلەی شاهی نەقشبەندی، ئەو بەرهەمەیە کە لێرەدا دەقەکەی دەخوێننەوە. تا ئەم دواییە وون ببوو، بەڵام د.هیداد حوسێنیش لە ل12ی کتێبی (ڕۆژنامەنووسیی کوردی سەردەمی کۆماری دیموکراتی کوردستان)ی چاپکراوی دەزگای سەردەم لەساڵی 2002 ئاماژە بۆ کۆپڵەیەکی ئەم شیعرە کراوەو لەپەراوێزی ژمارە (12)ی گوتویە دەقی ئەم شیعرە ڕەحمان مصباحی قازی لەگەڵ شیعرێکی خۆی چاپی کردۆتەوە.

3–مەمو زینی خانی بەموکریانی، چاپی یەکەم 1960، چاپی دووەم تاران 1979.

4–بۆ کوردستان (شیعر)، چاپی یەکەم 1966 کوردستان، بەلای کەمەوە چوار جار چاپ کراوەتەوە، دوا چاپی هی دەزگای ئاراس بووە لەساڵی 2000 دەرچووە.

5–چوارینەکانی خەیام، چاپی یەکەم کوردستان 1968 بەلای کەمەوە سێ جاری دیکە چاپ کراوەتەوە. دواچاپی لەساڵی 1369ی هەتاوی (1991) بووە.

"ئەوەی شایانی باسە ئەم سێ کیتابەی سەرەوە هەرسێکیان چاپی یەکەمی لەسەر ئەرکی مەلا مستەفای بارزانی چاپ کراوە".

6–شەرەفنامە، هەژار کردوویە بەکوردی، چاپی یەکەم نەجەف 1973، لەسەر ئەرکی کۆڕی زانیاری کورد لەبەغدا بووە، چاپی دووەم 1981.

7–هۆزی لەبیرکراوی گاوان، نووسینی مستەفا جەواد، (هەژار) کردوویە بەکوردی، بەغدا 1973.

8–یەك لەپەنای خاڵو سیفری بێ بڕانەوە، نووسینی: عەلی شەریعەتی. هەژار کردوویە بە کوردی.

9–ئاری برا وا دابرا، نووسینی: عەلی شەریعەتی.

10–عیرفان بەرامبەری ئازادی، نووسینی: عەلی شەریعەتی.

11–دایە! باوە! کێ خراوە، نووسینی عەلی شەریعەتی.

12–دیوانی مەلای جزیری، هەژار شەرحی لێ کردووە، چاپخانەی سروش– تاران 1982.

13–مێژووی ئەردەڵان، مەستورەی کوردستانی، هەژاری موکریانی لەگەڵ سەرچاوە گەلێکی تردا لەبەریەکی گرتوون و کردوونی بەکوردی، بڵاوکراوەی دەزگاری ئاراس ژمارە (160) ساڵی 2002.

–ئەم کتێبە هەمان ساڵ بەخشنامەی تازەنگاە لەئێران چاپی کردووە

14–پێنج ئەنگوست دەبنە یەك مست، بۆ منالان. لەفارسییەوە کراوە بەکوردی 1980، 1986 لەئێران چاپ کراوە.

15–هەنبانە بۆرینە (فەرهەنگی کوردی– کوردی–فارسی) چاپی 1988 لە دوو بەرگ دا بووە، چاپی ساڵی 1990 لە بەرگێك دا بووە، تاران.

16–قانون در طب، جزمی یەکەم. شاکاری ئیبن سینایە. هەژار کردوویە بەفارسی، سێ جار چاپ کراوەتەوە.

17–قانون در طب، جزمی دووەم. بۆفارسی وەرگێردراوە، دووجار چاپ کراوە.

18–قانون در طب، جزمی سێیەم، چاپ نەکراوە.

19–قانون در طب، جزمی چوارەم، چاپ نەکراوە.

20–قانون در طب، جزمی پێنجەم، چاپ نەکراوە.

21–قانون در طب، جزمی شەشەم، چاپ نەکراوە.

22–مەم و زینی خانی، مەم و زینەکەی ئەحمەدی خانی یە پێشەکی بۆ نووسیوە و ووشەگرانەکانی لێکداوەتەوە و لەگەڵ مەم و زینە موکریانییەکەی لەئیتالیا چاپ کراوەتەوە.

23–تاریخی سولەیمانییە، لەعەرەبییەوە بۆ فارسی، چاپ نەکراوە.

24–ڕەوابیتی فەرهەنگی ئێران و میسر، لەعەرەبییەوە کراوە بەکوردی– 1973. بەغدا.

25–فەرهەنگی فارسی بەکوردی بەلاتینی. چاپ نەکراوە.

26–اثار الثلاد واخبار الصباد، لەعەرەبییەوە فارسی، چاپ نەکراوە.

27–قورئانی پیرۆز، بۆکوردی وەرگێردراوە و پەخشی (احسان) بووە، چاپی تاران.

28–کۆمەڵە شیعرێك بەناونیشانی (بەیادی تۆ دەژی دڵم).

29–چێشتی مجێور، ئامادەکردن و سەرپەرشتی چاپ: خانی شەرفکەندی، چاپی یەکەم، پاریس– 1997؟

هەروەها لەو کاتەوە کە (هەژار) کۆچی دوایی کردووە، زۆر لە نووسەرانی دیکە بابەت و نووسین و لێکۆڵینەوەیان لەسەر بەرهەم و نووسینەکانی بڵاوکردۆتەوە. کە زۆربەیان لە دوتوێی بڵاوکراوەکانی هەولێر و ئێران و هەندەران دەبینرێن و هەموویشیان ناونیشان و شوێنی دەرچوونیان لای من تۆمار کراون و لەوانەیە زۆربەشیان لە کتێبخانەکەم هەبن.

ئەو بابەتانەی کە لەدوتوێی ئەم ژمارەیەی (ڕۆڤار) ئامادەکراون گەلێك لەوەندە پتر بوون کە لێرەدا دەیخوێننەوە بۆیە جاروبار وام بیر دەکردەوە خۆزگە ئەو بابەتانە لەکتێبێکدا چاپ بکرابان ناوی لێ بنرابا (هەژار نامە). بەڵام دیارە لاپەڕەکانی (ڕۆڤار) هەر جێی ئەوەندە ووتارانەی تێدا دەبێتەوە، بۆ نموونە: جاری لای هێروە ژیانی ڕۆژنامەوانی (هەژار)، وەك لەپێشەوە گوتم لەساڵی 1943 دەستی پێ کردووە و لەسەردەمی کۆماری کوردستان و دواتر لە ئاوارەییش هەر بەردەوام بووە لێی نەکۆڵدراوەتەوە.. دوای ڕوخانی (کۆماری کوردستان)یش (هەژار) یەکسەر ڕووی لەکوردستانی خواروو کردووە، دواتر چۆتە بەغداو لەوێ (حوزنی موکریانی)و (عەلائەدین سجادی)و کۆمەڵێکی دیکە لە ڕۆشنبیرانی ئەوسای کورد لەم بەشەی ووڵات ناسیوە، بۆیە لە هەردوو گۆڤاری "گەلاوێژ"و "دەنگی گێتیی تازە"دا بەئیمزای (هەژار)و (شرۆڵ) کۆمەڵێك بابەتی بینراوە. دواتر (هەژار) دەستی لەگەڵ (پارتی دیموکراتی کوردستان) تێکەڵ کردووە و بەردەوام لەتەك سەرکردەکانی بووە و لێیانەوە نزیك بووە، لەساڵی 1961دا کە خوالێخۆشبوو برایم ئەحمەد بۆ "پارتی دیموکراتی کوردستان" وازی لە ئیمتیازی ڕۆژنامەی (خەبات) هێنابوو بە "کوردستان"ی گوریبووەوە، (مام جەلال)یش ببووە سەرنووسەری ئەم ڕۆژنامەیە، (هەژار) لەتەك ئەو زاتە و خوالێخۆشبوو (عەبدولڕەحمان زەبیحی) سێ کوچکەیەکی پێکهێنابوو. ببووە کۆڵەگەیەکی گەورەی ئەم ڕۆژنامەیە، لەتەك ئیمزای (هەژار)و (شرۆل)ی پێشووی کۆمەڵێك شیعرو نووسینی بەبێ ئیمزاو بە ناوی (سیپاڵ)و (مام سیپاڵ)و (پەپووك) بڵاو کردۆتەوە، (بەڕاستی دنیایەکی سەیرە)ی هەژار لەهەر پێنج ژمارەکەی ئەم کوردستانە ئەوسا حەشری بە حکومەت کردووە. لەوانەیە بابەتەکەی (زمان درێژ)یش هی ئەو بووبێت هەموو ئەو بابەتانە تام و چێژی خۆیان هەیە و زۆربەیان ئێستاش دەخوێندرێنەوە.

وەك دەبینن هەرچەندەی قەڵەم بەسەر کاغەزدا بێنم وردە بابەت و سەربوردەی دیکە دێنە پێشەوە بۆیە بەوەندە وازدێنم و دەڵێم: تا نووسینی ئەم چەند دێڕانە نەگەیشتنی بابەتەکەی د.کەمال کەسەرێکی گەورە بوو لەسەر دڵم، بۆیە ناچار بووم بەدوای سەرچاوەی دیکەدا بگەڕێم تا خۆم چەند لایەنێکی دیکەی ژیانی (هەژار) بۆ خوێنەران هەڵبدەمەوە، بەڕێکەوت لەگۆشەیەکی کتێبخانەکەم ئەو بابەتەی (مەلا جەمیلی ڕۆژبەیانی)م کەوتە بەردەست کە بەناونیشانی (فیردەوسی کورد هەژاری موکریانی) نووسیویە، لەڕاستیدا بەبیرم نایەتەوە ئەم بابەتە بۆچی لەنێو ئەو کتێب و بڵاوکراوانەدا بێ ناز مابووەوە کە هەموو جار بۆ کاکە حەمەدی مەلا کەریمی دەنێرم؟ نازانم ئەو بابەتە بۆچی لەم سیمینارەش نەخوێندراوەتەوە کە لە هەولێر سازکرا؟ هۆیەکەی هەرچییەك بووبێت با بۆ کاتی خۆی بمێنێتەوە تاجارێکی دیکە چاومان بە کاکە حەمە دەکەوێتەوە و هیوادارم ئەوو د.کەمال لە قەزاو قەدەری ئەو شەڕە بەدوور بن و با بەیەکەوە بەێ ئەوەی دەسکاری بابەتەکەی مەلا جەمیل بکەین بیخوێنینەوە.

2003/4/9

# دەمێک لەگەڵ کاک ماجد ڕۆحانی

بەرپرسی بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکانی مامۆستا هەژار

بەبڕوای من، باس لەباری شێعرو هونەرو زانستی ئەو پیاوە گەورە، زۆر پێدا هەڵگوتنی ناویو بۆ شتێک کە وەکوو خۆر وایە، با هەوری نەزانیو بێ خەبەریش زۆر ڕەشو چڵکن بێو نەیەوێ سێبەری تاریکی لەسەر عالەم لادا، بەڵام هەموو دەزانین کە هەوری وا بۆ هەمیشە خۆی ناگرێو هەر ئەوەندەی خۆشە بایەکی بەقەوەت هەڵکا، لەبەریەک شی دەبێتەوەو هەر پارچەیەکی بە لایێکا هەڵدێ. ئەوجار لەئاسمانی سافو بێ گەرددا ڕۆژ خۆی دەردەخاو دنیایەک ڕوون دەکاتەوە.

هونەرمەندیو دەس ڕەنگینی مامۆستا هەژاریش –خودایار بێ– لەوە تێپەڕ بووە کە بە زەبری زۆردارانو گەلخۆران وەشاردرێو داپۆشرێ. شوکور زۆر لەنوسراوەکانو هۆنراوەکانی ڕووناکیان دیوەو دەستی خەڵک کەوتوونو لەبازاڕی زمانو زانستو هونەرو فەرهەنگدا قەدرو قیمەتیان لە گوتن نایە.

کێیە نەزانێ کەهەژار 24 ساڵە بووە کە نازناوی "شاعیری میللی کورد" وەرگرتووە.

کوا کوردێک لای کەم هەند پارچە شیعری هەژاری بۆ ئاودەنگی گۆشەی تەنیایی دڵیو هاودەنگی کۆڕی یارانی، لەبەر نەبێ؟

کام خوێندەواری ئێرانیە نەزانێ لە سایەی قەڵەمی هەژاردایە کەپاش هەزار ساڵ دەتوانێ قانوونی بوعەلی سینا بە فارسی بخوێنێتەوەو کتێبخانەکەی بەو کتێبە ناوبانگ دارە برازێنێتەوە.

بەڵێ مامۆستا هەژار لەو بارەوە پێداهاتنو پێدا هەڵگوتنی ناوێو بەهۆی یادگارە بە نرخەکانیەوە، ئاشکرایە کە هەتا رادەبرێو ڕۆژگار تێپەڕ دەکا، ئەو ناوە بەناوبانگتر دەبێو جوانتر خۆی دەنوێنێ.



بەڵام لەبارێکی یەکجار بایخدارەوە، ئەگەر بەو وێنە کەپێویستە باسی نەکرێتو لەسەری نەنووسرێت، وەیدچێ کە پاش ماوەیەک لەبیربچێتەوو وەکوو زۆر شتی تر کە بەداخەوە لە درێژایی مێژوودا لەبیرکراونو لەدەست دراون، ئەوەشمان بفەوتێ.

ڕەنگە زۆر کەس نەزانێ کە ئەو پیاوە گەورە زیاتر لەنیوەی عومری، یا لەگەڵ زۆرداران بەشەڕ هاتووە، یان ناعیلاج نیشتمانو خێزانی بەجێ هێشتوەو لەدەستیان هەڵاتووە. بە جۆرێ کەماوەیەکی دوورودرێژە لە چوار دەوڵەتان قاچاخ بووەو نەیوێراوە خۆی ئاشکرا کات.

ئەرێ بەراستی ئەوە بۆ؟ ئەوپیاوە زانایە کەسێکی کوشتبوو؟ ماڵێکی تالان کردبوو؟ یان شوێنێکی ئاور تێ بەردابوو؟ تازە ئەگەر واش بووبێ، کێ دیویە بەو جۆرە دنیایەک لەسەر سزادانی جەردەیەک یا پیاوکوژێک هێند سووربێ.

نەخەیر، تاونی مامۆستاکەمان ئەو شتە "بچوکانە!" نەبوو کە وا بەسووکو هاسان دەستی لەسەر هەڵگرنو دڵی لێ پاکەوەکەن.

هەژار تاوانباری قەڵەمەکەی بوو کە هەموو کاتو ساتێ دەگەڵ ئەوەدا کە نوسخەو مەلهەمی زامی چەوسێنراوانو لێ قەوماوانی دەنواند، ژەهراوی لە ژەهری مار تاڵ تری دەگەرووی زۆر بێژانو خوێنرێژان دەتکاند.

هەڵۆی بەرزەفری قەڵەمی هەژار بەدوو شاباڵی زانستو هونەرەوە لە هەورازان سەردەکەوتو لە ئەشقی عاسمان بۆ دنیای پڕ لە هەرای خوارەوە دەیڕوانی؛ لە هەرکوێ خاوەن زۆرێکی ملهوڕی بدیبایە کە بۆ ڕاوی داماوێکی بێ دەستەڵات خۆی تاو داوە، بۆ دایدەداو ڕاوی لێ بەتاڵ دەکردەوە.

هەرچەندێکیش کە زیاتر لەگەڵی حەولیان دەدا بەڵکو دەس هەڵگرێو وازبێنێتو بیرێک لەژیانی تاڵو ژنو منداڵی ئاوارەی بکاتەوە، زیاتر پای دادەگرتو لەسەر بیرو بڕوای خۆی شێل گیرتر دەبوو.

بەڵێ بەڕاستی زۆر حەیفە کە ئەو بارە گرینگە لە ژیانی مامۆستا هەژار لە بیرەوە بچێتو ئەورێو شوێنە پیاوانە –کە هەژار بۆی ڕوون کردوینەوە– کوێرەوە بێت.

**پرسیار: چۆن لەگەڵ مامۆستا هەژاردا ئاشنا بوویو چۆن ڕێگاتان کەوتە "سروش"؟**

وەڵام: نەورۆزی ساڵی 59ی هەتاوی بەڕێککەوت یەکێ لە دۆستانم لەتاران چاوپێ کەوت؛ کەپێش ئینقلاب هاو دەرسی دانشگا بووین. پاش سڵاوو مەرحەبایی.

گوتی: ها! لەبیرتە پێش ئینقلاب دەتگوت: ئێمە لەباری فەرهەنگیشەوە ژێر

چەپۆکین و ڕێگامان نیە بەزمانی خۆمان بنووسین و بخوێنین؟ دەباشە، ئەگەر پێت خۆشە ئێستا فەرموو ئەوە لە "سروش" مەودا هەیەو دەتوانی بەکوردی بنووسی و لەچاپی بدەی.

بەم جۆرە لەگەڵ "ئینشاراتی سروش" دا ئاشنابووم و بەشی کوردی سروش دامەزرا.

پاش چەند ڕۆژێك کۆبوونەوەیەکمان بوو کە مامۆستا هەژاریش تێدا هاوبەشی کرد. ئەوە هەوەڵ جار بوو کە بەخزمەتی دەگەیشتم و وەك لەپێشەکی چاپی دووەمی خەییامە کەیدا نووسیویە: "تێ گەیشتم پلەو پایەی مەردایەتی و زانیاری ئەو پیاوە هێند لەسەرە، ئەگەر ئێمەمانان بمانەوێ بۆی بڕوانین، کڵاومان لەسەر دەکەوێ."

بەو جۆرە، بەشی کوردی سروش – بەهاتنی، مامۆستا هەژار– گیانی تێ کەوت و پێش هەموو کاری چاپ و بەرهەم هێنانی وەرگێراو و نووسراوەکانی مامۆستا وەئەستۆ گرت.

**پرسیار: وەک بیستوومانە مامۆستا قورئانی بەکوردی وەرگێڕاوە. ئایا ئەو کارە تەواو بووە؟**

وەڵام: بەڵێ تەواوەو بەدەنگی خۆشی لەسەر شریت تۆمار کراوە؛ بەڵام لێرەدا دەبێ ئەوەتان عەرزکەم کە مامۆستا زۆری پێ خۆش بوو کە پێش هەموو کارێ مامۆستا هادی موڕادی ئەو تەرجەمە بخوێنێتەوەو لەگەڵ قورئاندا لێکی بداتەوە.

کاك هادی جوزئی ئەوەڵی دەبینێ و تێبینیەکانی خۆی بۆ مامۆستا دەنووسێ. کە پاش ئەوە بەخزمەتی مامۆستا گەیشتم، فەرمووی: ئەوە تۆش بزانە! ئەمن هیچ کارم بەو قورئانە نەماوەو هیچ نیگەرانی نیم.

وتم: چۆن قوربان!

فەرمووی: قەڵەمێکی سوورم داوە بە کاك هادی. بەو مانایە کە بۆخۆی دەزانێ چدەکا. لەهەر کوێ پێ خۆش بوو، خەتی بەسەردا بکێشێ و هەرچیکی پێ کەم بوو، لێ زیادکا. هەر چۆنێك ئەو پێی ڕاست بێ، دەبێ وابێ.

لەو ساتەوە مامۆستا هادی و شانی لەو کارە شل کردووە و دەستی لێ بەرنەداوە. جا پێکەوە لە خودا داواکەین بەڵکەم ئەو ئەرکە گرانە زووتر جێبەجێ بێت و قورئانی کوردی لە چاپ دەرچێ.

**پرسیار: ئایا مامۆستا هەژار کاری لەچاپ نەدراوی تریشی هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ چەن نووسراوەو وەرگێڕاوەیەك هەن. یەکیان بەناوی "تاریخی ئەردەڵان" وەرگێڕاوەی تاریخەکەی مەستوورە خانمی ئەدڵانە، کە مامۆستا پەراوێزی بۆ داناوەو زۆریشی لێ زیاد کردووە. هەروەها داستانی ژیانی خۆیە، بەناوی "چێشتی مجێور" کە بە ڕاستی کارێکی زۆر بەرزە. دو کتێبی دیکەشی هەن کە لە عەرەبییەوە وەرگێڕاونەتە سەر فارسی و پێش ئینقلاب رادیۆ تلویزیون لێی ساندبو گوایە چاپی بکا، یەکیان بەنێوی "تاریخ سلیمانیە" و ئەوی کەیان "روابط فرهنگی ایران و مصر"؛ نەچاپ کراون و نەش شوێنی کتێبەکان دیارە!

**پرسیار: هێندێك زیاتر باسی بیرەوەری و یادگارەکانی خۆتان لەگەڵ مامۆستای هێژا بۆمان بگێڕەوە.**

وەڵام: ساڵی 61 و 62 بوو کە تا ڕادەیەك لە ژیانی مامۆستا خەبەردار بووم؛ شتهایەکی بۆم گێڕابووەوە. زۆری لێ پاڕامەوە بەسەرهاتی خۆی بنووسێت، با ئەو یادگارە گرینگەش نەفەوتێ. دەیفەرموو: کاکە ئەوە بۆ چاپ نابێ و تووشی هەزار دەردمان دەکا.

–باشە قوربان! ئێستا نەکرا، کەسێ چوزانێ داهاتوو چدەبێ؟ ئەوە خودایە منداڵەکانمان بتوانن لەچاپی دەن.

لەساڵی 63دا ئاخری دەستی کرد بەنوسینەوەی بەسەرهاتەکەی و ساڵێکی نەخایاند تەواوی کرد و نێوی نا: "چێشتی مجێور". موناسیبەتی نێوەکەشی ئەوەیە کە بۆ خۆی دەیفەرموو، لەلادێ ڕۆژی جێژنی ڕەمەزان یا قوربان، پاش نوێژی جێژن، هەر کەس لەماڵەوە چێشتێکی بۆ دێت و لە مزگەوت نانی دەخۆن. جا ئەوەی کە دەوڵەمەندە دیارە پڵاوو گۆشت و فەقیریش شەلەم و بورووش چێشتی فەقیرانەی بۆدێنن. هەرکەسەش هێندێك لە چێشتەکەی خۆی بە مجێوری مزگەوتەکە دەداو مجێور هەمووی لە مەنجەڵێك خڕ دەکاتەوە. دەبێتە شتێکی سەیر. دەبینی گۆشت و بورووش پاڵیان بەپاڵی یەکەوە داوە. خۆش و ناخۆش تێکەڵن دەیفەرموو: ئەو کتێبەش وای لێ هاتووەو تێیدا تاڵ و سوێرو ترش و شیرین تێکەڵن. کەوابوو وەکو چێشتی مجێور وایە.

**پرسیار: لەکتێب و نوسراوەی مامۆستا هەژار چکارێکت بەدەستەوەیە؟**

وەڵام: دەزانن کە مامۆستا مەم و زینی خانی بە سۆرانی هۆنیوەتەوە، دوو جاریش لەچاپ دراوە. زیاد لەوە لەم ئاخرانەدا چەند نوسخەی کۆن و تازەی لەمەم و زینە کرمانجیەکە دەست خست و توانی لەونە نوسخەیەکی بێ هەڵەو بێ گرێ کۆ کاتەوە. ئەمجار وشە دژوارەکانی مانا لێ داوەو وەرگێراوە کە خۆی دەگەڵ خست و پێشەکیەکی یەکجار جوانی بۆ نووسی کە ئەنستیتوی کورد لە پاریس چاپی کردو چەن بەرگیشی بۆ من نارد؛ ماڵی ئاوا.

ئێستا زۆر ئارەزوومە گیروگرفتەکانی لەسەر لابەین و چاپی بکەین کەبەڕاستی کارێکی کارانەیە.

لەداهاتووش دا بەیاری خودا تاریخی ئەردەڵانەکەش چاپ دەکەین.

**پرسیار: سەبارەت بەتاریخ و زمان و فەرهەنگی کوردی، سروش کاری تازەی هەیە؟**

وەڵام: بەڵێ لە داهاتوویەکی نزیکدا بەرگی سێیەمی "مشاهیر کرد" دەردەکەوێ کە هیوادارم وەکوو بەرگەکانی یەك و دووی بتوانێ جێگای ڕەزامەندی و خۆشبونی خوێنەران و ئەدەب دۆستانی بەتایبەت کوردبێ.

*لەژمارە10ی ساڵی 1371ی گۆڤاری ئاوێنە، لەلاپەڕە (12–17)دا بڵاوکراوەتەوە.



# یادی فیردەوسیی کورد هەژاری موکریانی

نووسینێکی بڵاونەکراوەی: جەمیل ڕۆژبەیانی

"ئێمەش دەمرینو دەبینە خاکی سەرەڕێ
ئەم "ڕۆژە شەوە"ش تەنویری سوبحی دەکرێ"

* * *

"بێبستە فەلەک ئاشەکی وای ناوەتەوە
بۆ هاڕدنی ئێمە چ عەجاییب دەگەڕێ!"

خەلیفە سادقی گوندی شەرەفکەندی، ساڵی 1300ی فارسی 1922ز کوڕێکی بوو ناوی نا "عبدوڕەحمان. هۆی ئەم ناوە دووشت بوو: یەکەم، خەلیفە لەمەلایانی بیستبوو "أحب الأسماء إلی الله العبادلة- عبدالله و عبدالرحمان". ئەوە بوو کە شیعەی ئازەربایجان زۆریان ڕق لە ناوی عەبدوڕەحمان دەبووەوە، لەبەرئەوە زۆر لە ناوانی کوڕە سونناییانی دەوری موکریان عەبدوڕەحمان بوو. خەلیفە سادق کە مریدی شێخی بورهان بوو، مەلاو خوێندەواری زۆر خۆش دەویست، کوڕەکەی نابووە بەر خوێندن. ئەم کوڕە لە قوتابخانە، فارسیو عەرەبیو کوردیی خوێندبوو، پاشان ماوەیەکیش فەقێ بوو بوو. دیوانی میسباحو هەستیارانی موکریانی خوێندبووو لەبەرکردبوو، هەستی وتنی هەڵبەستی پەیداکردبوو، وردە- وردە سەرچاوەی مێشکی، تەڕیی زەوقی هاتبووە نزە. کاری دەشتەکییانەی وەک جوتیاریو شوانیو دروونیو ئەوانەی هەموو تاقی کردبووەوە. لە چەند گوندێکیش وردە مەلایەتییەکی کردبوو. ئنجا هاوسەرێکی پەیداکردبوو، چوند منداڵێکی بووبوو. ڕەنجی زۆرو نەبوونیو دەسەڵاتی بێگانە دەروونی ئاخاندبوو. ساڵانی 1324- 1325= 1964-1947ز. کوردایەتی لە نەمامییەوە بووبوو بەدارێکی پڕبەری سەربەرزی لقو پۆپ بڵاو. داگیرکارانی کوردستانو ئێران تەنگیان بەدەسەڵاتی ناو وڵات چنیبوو، مەیدانی چەوساندنەوەو سەرکوتکردنی بیرو هۆشی ئازادانیان بۆ نەدەگیرا، هورای "بڕووخێ تەلاری زۆرداران، بچەسپێ دەسەڵاتی خۆماڵیی کوردستان"، گوێی فەلەکی دەبزواند. ئالەم کاتەدا هەژار بووبوو بەشاعیری جومهووریەتی کوردستانی دامەزراو، بولبولی باخی گوڵی نیشتمان، خۆیو هاوڕێکانی ڕۆژنامەو کۆوارو نامیلکەی کوردییان بەکوردستان ڕادەگەیاند. لەم سەردەمەدا عەبدوڕحمان "ناتۆرە"ی هەژاری نەک "نازناو" بۆ خۆی هەڵبژاردبوو. ناسیاویی لەگەڵ گەنجانو جەنگاوەرانی کوردستانی خواروو، کە نەک تەنیا جوامێرانی جەنگیی وەک جەنابی مەلا مستەفای بارزانیو مستەفا خۆشناوو نووسەرو خوێندەوارانی وەک بلەو حەمزە کە گەییبونە ئەوێ پەیداکردبوو، بەڵکو لەگەڵیاندا بووبوو بەدۆستو ئاشنا. پاش ڕووخانی کۆماری کوردستان بەهۆی ڕێك کەوتنێکی "مامڵەی نەوتی"ی سۆڤیەت لەگەڵ شایەتیی ئێرانو قەوامی، سەرەك وەزیری، ئیتر ئیمپریالیزمی سۆڤیەتی وەکو ئەو ئیمپریالیستە نەتەوەخوازەکان پشتی کردە کۆماری مەهابادو سەرانی کۆماری بە گورگان خواردا، هەستیارانی وەکو هەژارو هێمنو نووسەرانی وەکو زەبیحی خۆیان شاردەوە، کە نەکەونە بەر شاڵاوی گورزی کوشندەی دوژمنانی کردبوو بەکوردستانی عێراقا. لە ساڵانی 49-50دا کە من لە موعتەقەل بوومو پاشان بووبووم بەمامۆستاو ئیمامو خەتیبی

مزگەوتی پاشای جاف لە قزڵ ڕەبات (خوسرەو ئاباد)ی کۆن کاک هەژاری گەنجی لێقەوماو پاش ئەوی ماوەیەک لە گوندی سیتەک لە ماڵی شێخ لەتیفی حەفید دەمێنێتەوە، باروبنە بۆ بەغدا دەپێچێتەوە. لە پاش ژیانێکی پڕ لە کولەمەرگی لە خزمەت نەقیبی گەیلانیداو چەرمەسەرێییەکی لە کێش بەدەر، لە دووکانێکی وردەفرۆشیدا لە تەک شەربەتخانەکەی ئەبو زبالەی بەرانبەر کۆڵانەکەی جدید حەسەن پاشادا ماوایەک دەحەوێتەوە.

بەڵێ 44 ساڵ لەمەوبەر بوو گەنجێکی سوورکەڵەی تەمەن بیست ساڵی جۆشی کوردایەتیی لە دەروونیا وەک بورکان دڵو جەرگی ئەخواردەوە، شەووڕۆژ یاوەری هەژار بوو لە هوتێلەکەی پاڵ قەڵای سەید ڕەشیدی پێنجوێنیدا، پوولٚ پەیداکردن لەسەر هەژارو کەیوانۆیی لەسەر ئەم کوڕە سورکەڵەیە بەمەرجێ لە کوردی فێرکردنو سەرمەشق دادانی کوردایەتییدا مەردانەی لەگەڵدا خەریک بێ. ئەو گەنجە ئامادە بوو لە پاڵ هاوڕێیەکی لێ وەشاوەیدا ڕێی سەختو هەڵدێری ئەرک بەجێهێنان بگرێتە بەر، بڕوا بەرەو "وارشۆ" پارچە هەڵبەستەکەی هەژار لە فاستیڤاڵی لاوانی جیهاندا بخوێنێتەوە کە بەم جۆرە دەست پێ‌دەکا:

"کوردێکم دەوێ چاپکو پتەو
سەفەرێک هەیە بۆم بکا بەشەو
نەهێڵی تورکو عەجەم بزانن
داگیرکەرانن لە کوردستانن"

ئەم گەنجە سورکەڵەیە، ئەمڕۆ زانایەکی مەزنی 68 ساڵ تەمەنی خەمکەی خەمانی گۆشەگیری "زاهید"ی قەلەندەرانە ژیان بەسەربەرە، ئەگەر بۆ هەندێ پێویستیی زانینی وەیا لەگەڵ وەرگێڕانی هەندێ کتێب بۆ کوردیو عەرەبی نەبوایە، لەم تەمەنی ئێستەدا کە پێویستی بەیارمەتیی هەموو کوردێکی دڵسۆز هەیەو جگە لە د.حەسەن بەگی جاف کەسێکی تر نەبوو بەدادیا بگاتو ئەگەر خزمەتە زۆرەکانی کۆنی نەبوایە ڕەنگە کەس نەیناسییایە... ئەو بورکانەی گەنجییە وەخت بوو ببێ بەکونجی خامۆشیو خەم بەخەرمانی، بەڵام خوای تۆ کردی، کوڕانی جەنابی مەلا مستەفای بارزان ئێستا داڵدەیان داوەو خەمەکانی گشت ڕەویونەتەوەو سەرلەنوێ بەگڕوگڵپە کەوتۆتەوە..

هەژار هەرچەند بۆ خۆشی لە ساڵی 53دا چوو بۆ بوخارێستو لەوێ بەهەزار ناری عەلی دەنگی بەزۆر کپکراوی نەتەوەی کوردی بەگوێی لاوانی جیهاندا هەڵدا، بەڵام بەبڵاوبوونەوەی ئەم نامەیەی "بۆ وارشۆ"ی ناوی کەوتە سەر زمانانو بووە هۆی بەدوایا گەڕان. ئەو گەنجە سورکەڵەیە بۆی گێڕامەوە کە چۆن بەنازم حیکمەتی تورکو میرزا دورسون زادەی تاجیکستانیو پۆپ ڕۆبسنو ئەدۆنیسو عەبدوڕەحمان خەمیسیو ڕەسووڵو بابایێفو چەند شاعیرو هونەرمەندێکی چینیو ژاپۆنیو کۆریاییو ڤێتنامی ناساندووە.

هەژاری موکریانی لە تاو بێ بژێویو بێ دەرەتانی لە بەغدا تووشی سیلو دیق هات. خێرەومەندانی کورد توانییان بەرەو سەناتۆریۆمی بەحەننەسی لوبنانی بنێرن. لەوێ دوو ساڵێ مابووەوە. پاشان گەڕایەوە بۆ بەغدا. وەک خۆی بۆی گێڕامەوە:

لەوێ لە مەسەحەکەی لوبنان دیوانێکی نالیی بەدەستەوە دەبێ، وردە- وردە زەمزەمە بەهەڵبەستەکانیەوە دەکات.

ڕۆژێ لە ڕۆژان نەخۆشێکی سەرسپیی مەلا گوێی لە زەمزەمەکانی ئەبێ، بەلایەوە دائەنیشێ و گوێی ئەداتە زەمزەمەکانی، پاشان پێی ئەڵێت: "ڕۆڵە شیعری نالی زۆر سەختە، ئەو کەڵە شاعیرە وەک خۆی وتوویە:

"نەزمی نالی میسلی ئاوو ئایینە ڕەنگی نییە
دوو ڕووە بۆ سەیری خاتر یەک خەفی یەک ئاشکار"

تۆ دەبێ وردبییەوە کەلە شیعرێکی بگەی.. هەژار وتی: من گەنجێکی خۆ بەهەستیاری ناو دەرکردووو کۆنە مەلا ئەزانی، لە دڵەوە گاڵتەم بەقسەی مەلا دەهات. مەلا هەستی بەوە کردبوو، لەپڕ لێی پرسیم: کاکی خۆم ناوت چییە؟ وتم: هەژار. جا دیوانەکەی لە دەست وەرگرتمو ئەمەی نووسی:

"کە بێ (ژێ) هاریوو بێ (هێ) کە (ژاری)
وەها وریاوو ژیری چۆن هەژاری؟!"

کە نوسراوەکەم خوێندەوە بۆم دەرکەون ئەم مەلایە، نەک هەر مەلایە بەڵکو بەڵایە، (بمبەخشن کوردەواری کە دەڵێن فلان بەڵایە، زۆر جار مەبەستیان ئەوەیە کە بلیمەتە..) ئیتر هەستام دەستم ماچ کردو خۆم پێ ناساند، ئەویش دەستم ماچ کردو خۆم پێ‌ناساند، ئەویش خۆی بەمن ناساند کە جەنابی مەلا محەممەدی چوڕستانی بوو. ئیتر هەموو ڕۆژێ لە خزمەتیدا وەکو فەقێ دیوانەکەم ئەخوێندەوەو هەڵەکانم بەڕێبەرێنی مامۆستا چاک ئەکرد، مامۆستا زۆر ئاشنای نالی بوو. زۆر جار بۆ وشەیێ چەندین واتای هەڵئەدا، کە من هەرگیز بەخەیالما نەدەهات، بۆ نمونە:

"ماچی دەمەکەی دامێ سەرو ماڵم"

وتی: ڕۆڵە سەیری نالی بکە، ئەتوانێ وشەی "ماچی" بە "ما"و "چی" لێک بدەیەوە کە بەمانای "بۆچی"یەو بەمانای "ماچ"یش بێ.

هەروەها "دەمەکە" (دەم) زار، "کات" (خوێن) یان "دە"و "مەکە"ش ئەبێت، هەروەها "دامێ" ئەشێ (دا)، "مێ" بێت..

ئیتر بەم جۆرە لە میسرەعی بەیتێکا ئەم نیکاتو وشە ئارایییانەی نالیی بۆ ڕوون کردمەوە، ماڵی ئاوابێ.

هەژار کەلە سەناتۆریۆمی بەحەننەس گەڕایەوە بۆ بەغدا، ملی لە کاری وێنەگری نا، بەڵام سیخوڕە کوردەکانی ئەو ئەبوایە خۆی لە گەڕیان لادا. لە پاشان هەژار خێزانەکەی بەمنداڵێکی چوار ساڵانەوە هاتنە بەغدا، لە ماڵیمەلا یەحیای کوڕی مەلا محەممەدی چوڕستانیدا کە خێزانەکەی کچی کوردێکی مەردی سنەییی کارمەندی ئیتفائییە بوو، ژوورێکی بەکرێ گرت. ڕۆژێکیان گەنجە سورکەڵەکە کوڕە چکۆلەی هەژاری بەنەڕەی شانیا دابوو، لەگەڵ هەژارا بردبووی لە خەستەخانەی مەجیدییە خەتەنەی کردبوو. بەڵام هەر لە پەنجاو شەشەوە ناچار بەماڵو مناڵەوە خۆی گەیاندە گوندی توربە سپیانی ماڵی مستەفای حاجۆ ئاغا، لەوێ لە خزمەت مەلا شێخ مووس، جگەر خوێندا تا ساڵی پەنجاو هەشت مایەوە. ئەو وەختە زەبیحیش لە شام بوو، گەنجە سورکەڵە لە پەنجاو شەشدا لە شام دیتبووی. مەلا حەسەنی قزڵجیش هێشتا هەر لە دوای لە زیندانی نووری سەعید بەربوونیان لەگەڵ زەبیحیدا لە بەغدا، هەر لە گوندێکی لای سنە بوو، کە هەر چواردە چیرۆکەکەی کەشکۆڵی گەدای لێنووسیبوو(1).

هەژار لەو ماوای دوو ساڵەیدا کەلە سووورییە دەبێ جارێکیان لەگەڵ زەبیحیو کەنیشکەکەی جەلادەت بەدرخانی نەمر، سینەم خانمدا بەڕووتو ڕەوجاڵی بۆ ئاڵمان دەچن، کەلە میهرەجانی لاوانی جیهان لە ساڵی 57دا لە مۆسکۆ، هاوبەشی بکەن. بەڵام بەداخەوە، هەر بەدەسکیسەی زۆڵە کورد نەیانتوانی بوو، فریای ئەو میهرەجانە بکەون، عەلی حەیدەر سولەیمانی کوردی بەئەسڵ ڕەواندوزی کە ئەوساکە باڵیۆزی عێراق بوو لە ئەڵمان، فریایان نەکەوتایە لە کۆڵانەکانی بەرلیندا لە برسان گیانیان دەرئەچوو. خوا کاری ڕاست کا، ئەو هێندێ خەرجییان ئەداتێو بەرەو شامیان ئەگەڕێنێتەوە. هەژار لە توربەسپیان بەیتی سەرەمەڕی کە ئەسڵەکەی، وەك گەنجە سورکەڵە، بۆی گێڕامەوە بەتورکی ناوی "سرچە کوشك"ەو لە نووسینی سەباحەددین عەلیی تورکی کۆمۆنیستی کۆنە. مام هەژار بەدەسکارییەوە بەناوی "سەرەمەڕ"ەوەی بەکێشو سەروای کوردیی خۆماڵییەوە کردووە بەسۆرانی هەروەها هەڵبەستنامەی مەمو زینیشی کردووە بەکوردیی باکوورو دەستی نەڕزێ.

هەژار بۆ ژیانو گووەرانەکەی خەریکی وێنەگری بوو، سەیرە، مام گیویش هەر بەو کارە لە هەولێر گیرسایەوە، قالە سووری خەزووری حەسەن زیرەکی گۆرانیبێژو قالەکەی تریش هەر بە "عەککاس"ییەوە خەریك بوون، تەنیا حەمە سمێڵ نەبێ کەلەم دواییانەدا بوو بەحاجی محەممەد، دەستی بەکاری زێڕینگەری کرد. کوڕێکی چاکە.. هەژار دووکانی وێنەگرییەکەی کردبوو بەکۆگای ئەدیبانو نووسەرانی کورد.. هەژار چەند ساڵێ بەو جۆرە ژیا. ئیتر ئەوە بو کە شۆڕشی 14ی تەمووز، شۆڕشی ئازادیی مەزنی گەلی عێراق ڕوویدا، لەم هەلەدا جەنابی مەلا مستەفای بارزانیو هەموو شۆڕشگێڕانی بارزانیو کورد گەڕانەوە خاکی پاکی وڵات.. ئەدیبانو نووسەران، چ عەرەب چ کورد چ تورکمان کەوتنە جووڵەی خەباتی ئاشکرا. ڕۆژنامەکانو کۆوارەکان کەوتنە نووسین. بەڕاستی هاتنەوەی جەنابی مەلا مستەفا بوو بەهۆی ئەوەی کە پارتی دیموکراتی کوردستان بە ئاشکرا بکەوێتە خەبات، بەڵام گێرەشێوێنی نەیار نێوان جەنابی مەلا مستەفاو چەند کەسێکی لە سەرانی پارتی تێك دا.

بارزانی لە یەکەم هەنگاودا ئەوانەی دەرکرد کە چەپ ڕشەو بوون، ئنجا لەگەڵ ئەوانەی کە خۆی پەسەندی کردبوون نێوانی سارد بوو. ئالەم حەلەدا هەژارو ئەحمەد تۆفیق ژمارەیەکی نهێنیی "بارزانی"یان چاپ کرد. ئەم پەرتووکە بوو بەڕۆژنامەیەکی نهێنی. ئیتر لێرەوە هەژار بەتەواوی بوو بەشاعیری شۆڕشەکەی مستەفا بارزانیی کۆڵنەدەر. هەژار جگە لەم ڕۆژنامەیە، بەهەندێ پارچە هەڵبەستی وەکو "دەمەتەقێی پیرۆتو باپیر"و "شیرین بەهارە" هەڵوێستی سیاسیی خۆی ئاشکرا یەکلا کردەوەو هەر ئەو پابەندیو یەکڕەنگییەی بێ خەوشەی خۆی بەرابەر بەجەنابی مەلا مستەفای بارزانی، وەك پیشمەرگەیەکی هەتاهەتاییی ئەو پیاوە مەردو شۆڕشگێڕەی نەتەوەی کورد، هەتا گیانی بەبینایی چاوان ئەسپارد هێندەی بستێکی لێجودا نەبۆوە.

کاتێ قاسم بەئاشکرا جەنابی مەلا مستەفای بارزانیی هەڵپێچا، هەژار هەر لە بەغدا مایەوە. من لەسەر وتارێ کە بەسەردێڕی "سیدی الزعيم لقد حسبتك ساهرا فنمت"م لە (صوت الأكرد)دا بڵاوم کردبۆوە، لە زیندانی ناسرییە 15 مانگیان دەست بەسەرکردم، چونکە مەحکووم نەبوومو تازە بەربووبووم، لە کۆمپانیای عەلی کەمال بەگدا بەناوی نووسەری مووچەخۆر دامەزرابووم. لەم کاتەدا چڵکاو خۆرەکان بێ ئەوەی حوکوومەت یان لایەنێك داوای لێکردبن کەوتبوونە نووسینی

وتارو برووسکە کردنی پڕجنێو بەمەلا مستەفا.. لە ڕۆژنامەیەکا لە زمانی هێندێ کەس و هەژارەوە دوو بروسکە بڵاوکرایەوە. لەو ڕۆژانەدا من چاوم بەهەژار کەوت، گلەییم لێکرد، وتی: مەلا تۆ منت هێشتا نەناسیوە، ئەوە کاری من نییە. لە دووکانی مام بەشیر ڕێك کەوتین بچین بۆ ڕۆژنامەی (المواطن) برووسکەکە بەدرۆخەینەوە. هەژار وتی: کاکی خۆم، من ناوێرم بچم ئەو برووسکەیە بەدرۆ بخەمەوە، من نیوچە قاچاخێکی ئێرانیم، ماڵو منداڵەکەم لە ئێرانەوە ڕایان کردووە هاتوونەتە ئێرە، ئەترسم بچم بۆ بەدرۆخستنەوەی برووسکەکە ئاشکرابم. ئیتر دوای ئەوە هەژارم کەم ئەدی. بەڵام پاش بۆرە ڕێك کەوتنەکەی دوای 11 ئازار لەگەڵ پارتی، هەژار بەئەندامی کۆڕی زانیاری کورد لە بەغدا هەڵبژێردراو هەژار بەو مرازە گەیشت دەزگایەکی چاپکردنی بۆ فەراهەم بێ، ئەوەبوو تەرجەمەی کوردیی شەرەفنامەی شەرەفخانی بەدلیسیو هۆزی لەبیر کراوی گاوان، لە نووسینی د. مستەفا جەوادی مەردو بەرەگەز کوردو زۆر شتی تری بڵاوکردەوە.

پیاو هەق بڵێ، من کە ئەوسا لە ئێران بووم، گەنجە سورکەڵەی خەباتگێڕی بورکانی، جارێکیان ئەم کتێبانەی بۆ ناردبووم بۆ تاران. شێخ ئەمینی نەقشبەندی، لە گرۆی تەحقیق چاوی بەکتێبەکان ئەکەوێ کە بەناوونیشانی "گروه تحقیق" نووسراوە، یەکسەر ئەیانپێچێتەوەو ئەیانبا بۆ کتێبخانەکەی خۆی. هەژاری هاوڕێی دەیان ساڵەهام، نوسخەیێ لە شەرەفنامە بەکوردی کردووەکەی بۆ نەناردم.

ڕۆژێ، تەلەفۆنێکم بۆ کرا، کە وەڵامم دایەوە، هەژار بوو. وتی لە فلانە شەقام، لە بەردەم فستانە ساختمان وەستاوم. چووم هێنامە ماڵەکەم، بێجامەیەکی شەعریی سپیم دایێ، وتی: کوڕە ئەوە زۆر سپییە لە کفن دەچێ، وتم: دیارە واز لە قسە قۆڕەکانت ناهێنێ؟! مام هەژار دوو برای لە تاران بوون: د. سەعید کە بە د. صادق ناسراو ڕەسووڵ، بەڵام پێی ناخۆش بوو لەو تەنگو چەڵەمەیەدا بەسەریان بکاتەوە، نەوەك سیخوڕو شۆفار ماڵەکەیان بزانن، وەڵێ سیخوڕو شۆفار ساڵەها بوو ماڵیانی ئەناسی. هەژار چەندین ڕۆژ لای من مایەوە، یادی کۆنمان بەبادا. ئیتر پاش چەند ڕۆژێ ئنجا لەو ژوورەی کە تیایا بوو، چوو سەرێکی دایەوە، وادیار بوو موژدەی بەخشینەکەی گەیشتبوو، خۆیو شاخەوان بەرەو مەهاباد چووبوونەوەو چوند مانگێ پاش ئەوە حەفتەی جارێ بۆ بۆ سەردانی کاکە حوسەینی خانەقاو موحسین دزەیی و هەژار دەچوومە کەرەج. لەو ڕۆژانەدا هێشتا مانگانەو مووچەیەکیان بۆ دیاری نەکرابوو.

مام هەژار لەگەڵ ئەمیری قازی بۆ دیدەنیی ئاغای جەعفەریان، یارمەتیدەری ئاغای قوتبی سەرۆکی سازمانی ڕادیۆو تەلەفیزیۆن چووبوون. چەند ڕۆژێ پاش ئەوە جەعفەریان داوای کردم چوومە لای، هەواڵی هەژاری پرسی، وتم:

نووسەرە، کوردی، فارسی، عەرەبی و تورکی زۆر چاك دەزانێ، دەیان کتێبی بەم زمانانە نووسیوە. هەر خۆی بەتەنیا سازمانێکی فەرهەنگێکی و ڕاگەیاندنە، زۆری پێخۆش بوو، وتی:

بۆ هاوکاری لە بەشی کوردی دای ئەنێین. وتم: نەو، وەکو من ڕەنجی بەخەسار ئەچێ.. قاقا پێکەنی، وتی: گروهی تەرجەمە و نەشر؟ وتم: زۆر باشە. وتی پێی بڵێ، دەس بەکاربێ و خەریکی دانانی فەرهەنگێکی فارسی= عەرەبی= کوردی بێ.. هەروەها پێشنیار دەکەم شەش هەزار مەنی مانگانە بدەنێ. وتم: پیرۆزە. وتی تۆ ئێستە مووچەکەت چەندە؟ وتم: سی و نیو... هەژار بە ناوی پەناهەندەگی تازە قەڵێوە شەش هەزار تمەنی تریشی بۆ بڕایەوە.. هەژار کەوتەوە جەفەنگ لێدان، ئەیوت: "منم بەم ئەسپەوە، بەم توورەکەی پڕ قەسپەوە.." ئینجا کە تۆزێ دڵنیاییی پەیاکرد، لە ماڵی ڕەسووڵ کە د. سەعیدی جونەمەرگیش هەر لەوێ بوو، جار جارە نیوە ڕۆژەیەك، یا شەوشەرەسێکمان پێکەوە دەخوارد. ئیتر سێ ساڵێ بەم جۆرە کاتمان بەسەربرد... هەژار بەڕاستی مەردێکی سەلارو هێمن و نیکتەباز و کۆگای قسەی نەستەق و گاڵتە و گەپ بوو. زۆری حەز لە فێربوون بوو. زۆر حەز لە فێربوون بوو. زۆر خۆ بە کەمزان بوو. جارێکیان بردمە ماڵی د. سیدیقی مفتی زادە، کە زانی ئەو پیاوە ئاشنای شیعری مەولەوییە، دوکتۆری ناچار کرد کۆڕی مێوانی بکا بە کۆڕی دەرز و لەسەر چۆك، فەقێیانە لێی دانیشت و دیوانەکەی مەولەویی بە دەسەوە گرت، ئەو ئەیخوێندەوەو مفتی زادەش بۆی ڕاست ئەکردەوە و ماناو مەبەستەکانی بۆ شەرح ئەکرد. بە چەند ساتێ چەنیدین پارچە شیعری بۆ خوێندەوە، سەری لە سیحری بەیانی مەولەوی سوڕما، بڕیاری دابوو ئەگەر مەولەوی هاوبازی نالی بوایە بە سەریا بازی ئەدا. لە بیرم چوو، بردمە سازمانی تەرجەمەو نەشر لای د. فەرەوەش، بڕیاردرا کە قانوونی ئەبو عەلی سینا بکا بە فارسی، لاپەڕەی بە 50 تمەن کە ئەیکردە ئەندازەیەکی زۆر. هەژار دەستی پێکرد. تا من لەوێ بووم بەرگێکی وەرگێڕابوو. بەخت چەواشەی هێنا، خوالێخۆشبوو جەنابی مەلا مستەفا چوو بۆ ئەمەریکا. شا ڕووخا ئایەتی خوا کاریان گرتە دەست. کاری ڕادیۆو تەلەفیزیۆن بوو بە باسی

وتـاری ئـایینیو قورئـان خوێنـدن. چـەند مانگـێ مووچـەیان نــەداینێ، هــەژار ئیــتر ڕووی نــەکرد بەســازمانی ڕادیــۆو تەلــەفیزیۆنا، بــەڵام مــن هــەر ئــەچووم و ســاتێ نەئەمامــەوەو ئەگەڕامەوە. ڕۆژێ هەژار سەر لەبەیانی تەلەفۆنی بۆ کردم، وتی مەلا گیان: کار خراپە. دوێنێ لەشاری کەرەجەوە موزاهەرەیێ بەرەو کەرەج هات بۆ قڕکردنی کوردانـی عەزیمییـەی کـەرەج، خواوڕاستان لـەڕێ گەڕابوونـەوە، بـەڵام ئـەمڕۆ سـات 10 شـاڵاو ئەکەنە سەر عەزیمییە، ئەمە سەرەنجامی وتارەکـانی شـوومی شێخ عیزەدین حوسەینییە کە لە یادداشتەکەیا بۆ حوکوومـەتی ئیسلام داوای دەرکردنی ئەو کوردانەی کردبوو کە پەناهـەندەی شابوون. جا تۆ هەر وەك بەنامەیەکی توندو تیژ سەرزەنشتی شێخ عیزەدینت کرد، ئێستاش هـەوڵ بـدە بـەری ئـەم شـاڵاوە بگرە.. ئەوەی ڕاستی بێ، من سەرم لێ شێوا. تەلـەفۆنێکم بـۆ ئیستعلاماتی ڕادیۆ کرد، داوای تەلەفۆنی دەربـاری ئایـەتوڵلام کـرد، ژمارەکانیـان دامـێ. کـەژمارەم وەرگـرت، یـەکێ لــە مودیرگشـتییەکانی ســازمانی ڕادیــۆو تەلــەفیزیۆن وەرامــی دامەوە، لەگەڵی کەوتمە گاڵتە، وتم من دەفتەری دەربـاری ئایـاتم دەوێ، نەك سازمانی ڕادیۆ، بەهەڵە ژمارەیان بەمن داوە. وتـی نەو نەو، هەڵە نییە، ئێرە دەفتـەرە. وتم تۆ لێرە چی دەکـەی؟ وتـی: ئێمـەش کە دوژمنی پشت پـەردەی دەورانـی شـابووین، ئێستە لەسـەر پەردەکەین. زۆر دڵم خۆش بـوو، وتم: کوردانـی کەرەجی پەناهـەندە دوێنێ تووشی مەترسییەکی وەها بـوون، ئەڵێن ئەمڕۆ دووبارە شاڵاویان ئەکەنەوە سەر. جارێ ڕێبەدێییم بکە چ بکەم؟ وتـی: لـەکوێی؟ وتم: لـەماڵ. وتـی: تەلەفۆنەکـەت چەندە؟ وتم: ئەوەندە. وتـی: نیو ساتی تـر وەڵامـت ئەدەمـەوە. لەم کاتەدا هەژار دووبارە تەلەفۆنی کردەوە، وتـی: موزاهەرەکە دەستی پێ کرد، ئەوا کەوتنە ڕێ بەرەو عەزیمییە، تۆ چت کرد؟ وتم: هێشتا نەگەییومە ئەنجام. ئنجا تەلـەفۆن زەنگی لێدایـەوە، مودیـر گشـتییەکەی دۆستم بـوو، وتـی: براگیـان، ئەحمـەدی مەدەنی کە ئێستە وەزیری جەنگە بەکۆپتەر چوو بـۆ کـەرەج، منیش بە تەلەفۆن هەواڵەکەم گەیاندەوە بە هەژار، ئەویش وتـی: ئێمــەش بڕیارمــان دا ئێســتە کــە ڕەشــید ســندیو مــەلاو دەروێشـەکان بە تـەپڵو دەفەوە بچنە پێشوازییان، بـەڵکو خـوا لەشەڕی ئایاتو لە خواستی شێخ عیزەدین ڕزگارمان بکات...

باش بوو وەزیری جەنگ خۆی بە کۆپتـەر لەبـەردەم موزاهەرەکە دابەزیبوو، ملاکانی بانگ کردبوو، وتارێکی بۆ خوێندبوونـەوە کەئەمانە کوردی لێ قەوماوی دەستی ئەمـەریکای ئیستیکبارن، ئەمانـە چینــی موســوڵمانی موســتەزعەفن، مێوانــی دەوڵــەتی ئیسلامن، لەمەودوا وەکو بـرا تەماشایان بکـەن. کـەس چارەیان دەربارە تورش نەکات.

بۆ سبەینێ هەژار تکای لێ کردم بچمە کەرج، کە چووم، وتی: شەو دڵشاد بارزانی تەلـەفۆنی بۆ باوکی کردووە، هـەواڵی ئـەم قەوماوەی بەباوكو براکانی داوە، هەموویان سپاسی تۆ دەکەن، دڵشادیش حەز ئەکات بتبینێ، وتم: مام هـەژار من ئـەرکی سـەر شانی خۆم بەجێ هێناوە، سپاسم ناوێ، من سپاسی تۆ دەکـەم کە ئەم خزمەتەت بۆ ڕەساندم..

سـەرەتای مارسـی 1979 ڕادیۆکانی جیهان هــەواڵی مـەرگی مـەلا مستەفای بارزانییـان بڵاوکـردەوە، شـەوی یەکشـەممە 4ی مـارس تـەرمی بارزانی لـە ئەمـەریکاوە بـەڕێی لـەندەنا گەیشتە تـاران. 40پـاس پڕ لـەئاوارەی وڵاتو خـەڵکی تری چاوەڕوانیی تەرمەکەیان دەکرد. لـەوێوە خسـتیانە ڕێ بـەرەو شـنۆ. هـەژار لەسەر خوابگای ئەبەدیی، ئەم هەڵبەستەی کە بەم دێڕە شیعرە دەس پێ ئەکا، خوێندەوە:

بارزانی پاڵەوانی کورد هیوای پیرو جەوانی کورد

سەرشیوەنەکە 38 بەیت بوو، بەم بەیتە دواییی هێنا:

من دەزانم تۆ نامری تۆ لە مردن بەهێزتری

لــەکاتی بــۆ وڵات گەڕانــەوەدا، هەرچــەند ڕۆژێ زووتــر دۆستـانو هـەواڵان هـەموو سـەریان لێ دام. دۆسـتی زۆر بـەڕێزم هـەژار کە ئـاخرین جـار دیتمـی کەوتـە جەفـەنگ، کـوڕە هەرکـە گەیشتی سەڵاوێ بە مەلا شوکرەکە بڵێ، بیخە یادی کە بۆ ئاخر جار لە شەقامەکانی ئەستەمبوڵ بە شـەپقەکەوە دیتم. ئیتر مام هــەژاری هەسـتیاری شـیرین گوفتـاری، زانـای نیکتـە پــەردازم جــارێکی تــر نەدییــەوە. تەنـها کتێبـەکانی بــەهۆی دوکتــۆر سـەعیدی جوانەمەرگەوە دەگەیەشتنە دەستم. بـۆ ئـەوە تـەواو بزانــی هــەژار کێیــە؟ ئــەو بەرگــە بخوێنــەوە کــە بــەناوی "هەژارنامە"وە نووسراوە. ئیتر لە پاومانا ئەڵێم: جێی ئەوێی کە خۆی ئەیویست... بەئێزەدی بەخشندەم سپارد.

# هەندێ لە نامەکانی هەژار بۆ مەم

1962/7/18

**برای خۆشەویست کاک محەممەد ڕۆژباش**

چەند ڕۆژێك لەمەوبەر نامەیەکم بۆ ناردی لەوێدا نووسیبووم (5)دینارم بۆ داوی بە مامۆستا گیو جا ئەمەم بۆیە نووسیبوو کەخۆم حازر کردبوو بیدەمێ بەڵام دایکی منداڵەکانم لێ نەخۆش کەوت. سەرت نەئێشێنم ئەوە لە حەوت ڕۆژدا نۆ دینارم بە دەرمان و دکتۆر چووە پارەیەکیشم لەلای کاك عەبدوڵڵا هەیە بە خوا ڕەنگە خۆی لە حەفتا، هەشتا دینا بدا بەڵام هەر دەڵێ جارێ نیمەو دەبێ سولفە وەرگرم جا ئەگەر دەزانی بۆت ممکن دەبێ ئەوا لەباتی من ئەو مانگە بیدە خۆ ئەگەر دەستیشت تاگاو پارەت نییە ئەوا پێم بڵێوە ئەگەر زێڕی دایکی محەمەدیشم بردبێتە بازاڕ پەکت هەر ناخەم چونکە بەڕاستی من زۆر دڵم بەو خانووەی ئەوێ خۆشە هەروەك بۆم نووسیبووی ئەوا وکالەتنامەکانم ناردووە بۆ قەڵادزە کە لەوێ ئیمزا بکرێن و بۆ تۆی بەڕێکەنەوە هەولێر جا بەحیسابی من دەبێ تائێستە بۆت هاتبێتەوە.

نازانم بۆچی نەهاتی بۆ بەغدا بەخوا زۆر چاوەڕوانت بووین. ئەحوالی ماڵەوە ئەپرسین هومێد وایە دایکت و خوشکت و هونەر ساغ و بەکەیف بن سەلامی هەموو لایەکمان بۆ هەموو لایەکتان. برام توخوا تەنبەڵی مەکە هیچ نەبێ لە15 ڕۆژدا جارێك کاغزمان بۆ بنووسە، سەلام لە تاهیر تۆفیق دەکەم، کورە خۆ ئەو مەلعونە هەزار جار بێتە بەغدا جارێك نایبینم. خوا عەقڵ بدا بە ئەولادی. ئیتر خۆشیت بەدڵ دەخوازم.

**برات: هەژار**

برای خۆشەویست کاکە مەم قەت پێم وانەبوو بە ژنهێنان ئێمە شت لەبیرچووە خۆمان فەلسەفەیەکمان بوو دەمان گوت بۆیە خەسوو ڕقی لە بووك دەبێتەوە چونکە کوڕەکەی لێ دەستێنی بەڵام وا دیارە ملی خۆشمانی گرتۆتەوە، وا بوکی تازە لە هاوەڵانیشی دەستێنی، وام لێ هاتووە وەختە هەموو بووکی دنیام ناخۆش بوێ بەبووکەکەشی بڵێ وا نەکا باشە چونکە وادیارە لەجیاتی خەسوویێك هەزار خەسووپەیدا دەکا کاکە بەڕاستی زۆر بێ خەبەرت هێشتوین هەر لە خۆت ئەپرسم جا ئەمە ئاردە هەمووڕۆژێ مەعصووم دوو جارم لێ دەپرسی کاك محەمەد چی کرد؟ چی پێ بڵێم. جا بەڕاستی چت کرد؟ تاپێی بڵێم. بەڵام تۆ سەری عەلی بەگی عەزیزو خۆشەویست کە دەڵێی کۆپی کاك وردییەو تۆزێك درێژترە فەورەن بەدرێژیو پانی کاغەزمان بۆ بنووسە با بزانین جێگات لە ئیعرابدا چییە. ئیتر وەکیلی سەلام و کەلام دایك و خوشك و بووك و وهونەرو عەلی بەگ و عەشیرەت و مامۆستا گیوو هەرچی دەیناسی.خەبەری کاك عەبدوڵڵاو کاك یوسفیش چ دەزانی بۆم بنووسە لەگەڵ خاڵم حەیدەر چی کردووە سەلام لەکاك جەوهەری شاعیرو نووسەری تووڕە دەکەم.

ئیتر چاوەڕوانی نامەتانین منداڵان هەموو سەلامتان لێ ئەکەن.

**برات: هەژار**

64/9/19

برای شیرینم کاکە مەم پێم خۆشە زۆرباش بی نامە ڕەنگینەکەتم پێگەیشت گەشاندمیەوەو هەرچەند تۆزێك دارکاریشی تێدا بوو بەلام چاوی خۆم قوچاند خۆت دەزانی لەو سەفەرەتدا ڕازی نەبووی بەخزمەتکردنی من بۆیە دەرگات هەڵبواردو چوویە ماڵە ئاغا، بەهەرحاڵ ئەوی ڕابرد ڕابرد. انشاء الله بۆ جارێکی تر ئەم پەڵەیەم لەسەر هەڵدەگریەوە.

کاکەگیان بۆ کامیراکەت نووسیوەکە پێی ڕازی نی. بەلام من ئەزانم زۆر کامێرای چاکەو ڕەسم زۆر باش دەگرێ، ئەگەر ئێستا باشت پێ نەگرتووە سووچی ئەو نییە سووچی خۆتە هێشتا فێری نەبووی‌و دەستت لێ ڕانەهاتوە... دەبێ ئەوەندەش بزانی کە من ئەو کامیرایەم بەپارە نەداوە بە تۆ بەلام ئەگەر بمگوتایە پارەم ناوێ ئەو دەمە نەتدەویست بۆیە گوتم 10دینار بدەو جارێ تاخۆم نەڵێم بۆم مەنێرە. جا چونکە من بەدیاریم داوە بەتۆ دیسان ئەگەر بەسەرم دادەیەوە زۆر ڕووزەرد دەبم با ئەو کامێرایەت بەیادگار هەر لەلابێ ئەگەر هەر پێشت باش نەبوو ئەوا ئەگەر هاتی کامێرایەکی تر پەیدا دەکەین.

کاکە گیان بۆ خۆت دەزانی کاکە عەبدوڵلا ئینتقادی لەکاری هەموو کەس هەیەو بۆ خۆشی زۆر جار تووشی هەڵە دەبێت جا کەمن حیکایەتی قەبض‌و شراکەتی جەمعیەتەکەم بۆ گێڕاوە گوتی: جا چۆن بەناوی خۆت نووسیووە. ئەو دەمە یان دەبێ خانووت هەبێ یان لە عەرز حاصلی کەلام ئەو دەڵێ با محەمەدی کورت بەشدار بێ نەك خۆت.

جا ئەگەر دەزانی قسەکەی مەعقولە ئەوا ناچاری ئەو درۆیە بفەرمووی‌و بڵێی من ناوەکەم لێ تێك چووە: عەبدولرەحمان محەمەد نییە بەڵکو محەمەد عەبدولڕەحمان محەمەد مستەفایە. خۆ ئەگەر دەشزانی وانییەو کاك عەولا لێی نەزانیوە ئەوا با هەر وەك خۆی بێ. بەلام بەڕاستی زۆر چاو دەبەرو شەرمەزاری خۆت کردم کە ئەم زەحمەتەت کێشاو ڕێکتخست. گیانەکەم من 5 دینارم دایتێ ئێستاش هەموو سەری مانگ 5دینار دەنێرم زیادیەکەش ئەدەم. بەقسەی کاك عەولا دەبێ تۆ سەری مانگ بێیتەوە بەغدا کاکە جا ئەوە ڕاسپاردەی ئەوە هەرچەند تۆزێکیش خۆم ئەگرێتەوە.

ئەگەر ممکن بوو گونیەیەك گەنم‌و گونیەیەك هەرزنە گەورە (أذرە) یاخۆ دوو گونیە گەنمی تۆزێك دەنگی وردمان لەگەڵ خۆت بۆ بێنە بۆ مامرەکان، زۆر سەلامم لە مامۆستا گیو بکە. ها باش بوو بیرم کەوتەوە من خۆم دوو دینارەکەم داوە بە ئەحمەد فەهمی تۆ دەگەڵ مامۆستای حیساب کە.

زۆر سەلامی هەموو لایەکمان بەهەموو لایەکتان بگەیەنە چاوی هونەر ماچ ئەکەین. هەر بژی بەخۆشی هەرچی تۆ خۆشت دەوێ سەلامی منی لێ بکە تاهیر تۆفیق نەبێ چونکە ئەو مەلعونە سەد جار دێتە بەغداو نامبینێ.

**هەربژی بۆ برات: هەژار**

**برای زۆر خۆشەویستم کاکە مەم**

**خۆشیت لەخوا دەخوازم**

زۆر بەداخەوە بیستوومە کە جوان نەماوەو دواییش نامەکەی خۆت تەئکیدی کرد. من خۆم وەکو باوکێك زۆر باش ئەزانم ئەو ڕووداوە چەند دڵتەزێنە بەلام واش تۆ ئەناسم کە زۆر واقعی تری لەوەی کە مەسئەلەی مەرگ‌و ژیانت بۆشی نەکرابێتەوە. لێم ڕوونە باشتر لەهەموو کەس ئەزانی کە ئەبێ لەڕووی دنیای دڵرەقا خۆت کزو بێچارە نیشان نەدەی.

چەندم پێ خۆشە قسەی ئە شاعیرە کە دەڵێ: لەڕووی ظالمان دا ئیظهاری عاجزی کردن وەك فرمێسکی کەبابە لەسەر ئاگر کە بڵێسەکە خۆشتر دەکا.

بەڕاستی منیش‌و مەعصوم بۆ ماوەیەکی زۆر تەمێکی وا دایگرتین کە هێشتا نەڕەوییوەتەوە، خوا تەمەنی سۆزان درێژکاو تۆڵەی ئەو خەسارەتەشمان بۆ بکاتەوە.

بۆ حکایەتی کاك عەبدوڵلاش زۆر پەرێشانم، تۆ بڵێی لەشکری بەلا دوایی پێ نەیە، بەهومێدم قڕانی تێکەوێ، دیسان هەر ئەوەنەم لەدەست دێت کە بڵێم خواچاکی بکات.

گیانە لەزمان مندا سەرەخۆشی لە براژنم بکەو مەعصومسش بەقەد ئەو ناڕەحەتە سەلامی ئەویشی لێ بکە.

کاکە مەم ئەگەر دنیا بوو ڕێگەت کەوتە بەغدا یان بەنامە بەکاک عەبدوڵڵا کانی مارانی بفەرموو دارەکانیان هەموو مصادەرە کردووە، سامی دەڵێ من وا بەباش دەزانم کاک عەبدوڵڵا بۆ خۆی بێ و بچێتە لای مام شەریف بەڵکو تا نەفرۆشراون شتێك بکا، ئیتر ئەوە ڕاسپاردەی سامییە، هەروەها ئەگەر خۆت چوویتە بەغدا عەبدوڵڵا شلێر ببینەو بفەرموو ئەگەر پارەیەك بۆ هەژار هەیە بمدەیەو لێی وەربگرە.

ئیتر خۆشیت لە خودا داوا ئەکەم

**برای دڵسۆزت: هەژار**

967/7/10

**نامەیەکم بۆ بەغدا نووسیوە داومە بەرزگار بەبێ زەحمەت لێی وەربگرەو بۆ خۆت بۆمان لە پۆستە بهاوێ.**

**برای خۆشەویستم ابو سۆران الورد**

نامەکەتم پێ گەیشت زۆر بەخەبەری نەخۆشیت دڵتەنگ بوومو غەیری ئاواتو دوعای بەخێر نازانم چیم لەدەست دێت.

کاکەگیان بەڕاستی زۆر لە خۆم تووڕەو وەڕەز بووم کەنامەکەی پێشووم بۆ نووسیبووی چونکە دەڵێن مارانگاز لەدەزووی ڕەشو سپیش دەترسێ. ئەوەندە تا ئێستا ڕەفیقانی دڵسۆز وازیان لێ هێناوم دەستم لەسەر دڵمە بۆ ئەوانەی ماون.

من لەوەدا سووچی کەس ناگرمو دەزانم بۆ خۆم نەقصو عەیبم تێدا هەیەو پیاو کە بەدبەخت بوو ئەو وردە کۆسپانە بۆی دەبن بە ئیعتیادی.

منێکی ئاوارەی دەربەدەر وەك کارگ هەڵتۆقیومو دەشمەوێ وەك خەڵکی خۆرهەڵاتی بەرانبەر بێمەوە، دیارە ئەو خەیاڵە خاوە تووشی هەزار داوم دەکا.

بەهەرحاڵ ڕوحمەکەم ئێستا کە چاو دەگێڕمو سەر هەڵدێنم تەنیا ئەستێرەیەکم بە عاسمانەوە ماوە کە تروسکەی هومێدێکی لێوە دەبینم ئەو ئەستێرەشم تۆی، حەز ناکەم ئاوابیو هەوری چڵکنی دڵ ئێشانت بێتە بەر، بەڵکو خوا لەو ئاواتەم دا ناهومێدم ناکا.

کاکە زۆر ئاواتمە زوو چاك بیەوەو زۆر سەلامم بۆ براژنمو چاوی منداڵەکان ماچ دەکەم ئیتر بەهومێدی دیدار.

**أبو مصطفى**

**برای زۆر بەڕێزم باوکی سۆران ڕۆژباش**

قوربان زۆر لەمێژە هیچ خەبەرم لێت نییە بە هومێدم خۆشت ڕابواردبێو ساغ بی و منداڵیش بەکەیفو دەماغ بن، ئەگەر لەئێمە دەپرسی لەسایەی سەری دۆستانەوە بێ خەمینو تەنیا وەڕەزی ئێوە دەکەین، مەعسوم هەر چوەنۆڕتانەو دەڵێ دێن بۆ لامان، کاکە نازانم خۆتان چۆنی بەباش دەزانن، بەڵام ئەوەندە ئەزانم کە ئەمساڵ جێگەکەمان لە هەموو ساڵان خۆشترەو ئاوەکەمان لە هەموو ئاوان سازگار ترە...، جا ئەگەر بێنو سەرمان بدەن زۆرمان پێ خۆش دەبێ، ئەگەریش یەن کاك ئەمینیش دیارە دەگەڵ خۆتانا دێنن.

کاکەگیان خۆشمو خۆشت هەر جارێك لامان وابووە کە خانووەکە نەفرۆشینو بۆ دوارۆژ ئەوەندەمان ببێ.. بەڵام وابزانم تەنگوچەڵەمەی ژیان بەرژەوەندی دوارۆژ لەبیر دەباتەوە، جا ئەگەر هەڵکەوتو کەسێکی وا هەبوو سەربەسەر بەو پارەی لێی صەرف کراوە هەڵی گرێتەوە لام وایە بیفرۆشیو چی دەمێنێتەوە بیدەی بەمنداڵەکان.

پەنجا دینارم لەلای کاك هاشم هەیە بەڵکو لە هاتنی منداڵەکانم بۆ لاتان لە ئەیلولدا بیان داتەوە.

تا کاك حافظ هەبوو ئێمە هیچ خەمی کرێ خانوومان لەبەر نەبوو بەڵام بەناشکوری نەبێ ئەو ئەوا لە خەستەخانە کەوتووەو وابزانم ئەبێ خۆت ئەو تەکلیفە بخەیتە ئەستۆو هەر بەسێ مانگ وابکەی کرێیەکەی بدرێ.. جا ئەگەر کاکە عەلی زاواشت دەستەبەر ببێ هەر زۆر چاکە خۆم شوکور کەسی ترم پێ شك نایە هاواری بۆ بەرم تۆ نەبی...

نازانم شەرەف نامەت خوێندوەتەوە یان نا؟ بەفارسی نووسراوەو لەلایەن محەمەد عەلی عەونیو مەلاجەمیلەوە دووجار کراوە بە عەرەبی، وا من ئێستا شانم لێ داخستووەو دەیکەم بەکوردی ئەگەر مەرگ مۆڵەت بدا وا بزانم شتێکی مناسبی لێ دەردەچێ، تا ئێستا نزیکەی نیوەم وەرگێڕاوە با بزانین چۆن دەبێ.

ڕەنگە تۆش وەك خۆم ڕزگاریو نور بخوێنیتەوە بەڕاستی لەو نەقدە لاذعو جوانەی کە کردبووی زۆر دڵم خۆش بوو زۆریشی خزمەت پێکردم بەڵام من چاوەنواڕ بووم زۆرترو خراپتر بنووسن... واتا بەداخەوە کەمیان نووسی، حەیفە پیاو هێندە وریاو زیرەك نەبێ لە نەقد کردندا!!.

بووکە شووشەی مامۆستا مارفم دیت خراپ نییە، بەڵام نازانم ئەوەکانی تۆ بۆ دەرنەچوون خۆ قەرار وابوو زوو دەرکەون یان دەرکەوتووەو من پێم نەزانیوە؟ نازانم... زۆر سەلامو کەلامم بۆ مامۆستا پیرۆزو زۆر سەلام بۆ کاك جەودەتو هەموو برادەرانت.

خۆشمو مەعصومیش زۆر سەلام لە براژنو لەدایك دەکەینو پڕ بەدنیاش سەلامو سوپاس بۆ کاك ئەمین.

چاوی هەموو منداڵەکان ماچ دەکەمو منداڵەکانمان دەستتان ماچ دەکەن.

ئیتر هەر بژی بەخۆشیو هومێدەوارم هەر سەربەرزو سەرکەوتووبن.

کاك سلێمان کە لەلامانە سەلامتان لێ دەکا.

**برات: باوکی مستەفا**

1969/7/21

**برای بەنرخو خۆشەویستم کاکە ئەبو سۆران ڕۆژباش.**

بەڵێ گفتم پێ دابووی کە زۆر زوو شیعری مام هێمنو مەقالێکی خۆمت بۆ بنێرم. بەڵام ڕەنگە زۆرباش تەبیاتی من بناسی. چل ڕووپەڕێکم پاکنووسی حاشیەی شەرەفنامە مابوو لەبەرچاوم وەك چیای هەڵگورد بوون شانم لێ داخستو هەموو شتێکم وەلانا تا ئەوم خەلاس کرد. ئەوسا ئەو مەقالەیەم نووسی جا نازانم بەدڵتە یان نا؟ ئەگەر پێت باش بوو ئەگەر ماوە ماوە لە هەولێردا چاپی بکە.

جا ئەوجار چۆنی چاکی شوکور؟ منداڵ خۆباشن؟ زۆر سەلامم بۆ براژنو دایكو هونەرو سافیە. ئەرێ کاکە لە بابەت یەکیەتی ئەیبانی هەولێرەوە چتان کرد هیچت بۆ نەنووسیم. چونکە ئەگەر بزانم هەر کۆسپتان دەخەنە ڕێگە تا لای مەلا مستەفا باسی بکەم، حەز دەکەم بۆم ڕوون کەیتەوە، من خۆم تا کتێبەکەم خەلاس نەبێ نایەمەوە، ئەگەر نامەم بەهۆی فەرانسۆ حەریری بۆ بنووسی پێم دەگا.

ئیتر وەکیل سەلامان بە، نازانم قاپە ماستەکانت دەست کەوتەوە یان نا؟ زۆر سەلامم بۆ حاجی ئەمین، تاهیر تەوفیقیشت لەبیر نەچێ سەلامی لێ دەکەم. خۆشیو سەرکەوتنت لە خوا دەخوازم.

**برات: هەژار**

1970/12/4

## ناسۆری تەشەنا

وەرە مەیگێڕ ئەوشۆ خەمی دڵ کەم کەم
لووزەوم بەردە سەری نامەوێ جورعەی کەم
تەشەنا بۆتەوە ناسۆری دەروونم دیسان
زامی کۆنە... بەمەیی کۆنی دەبێ مەلحەم کەم
مشتومالی دەوێ ئاوێنەیی ژەنگاوی خەیاڵ
مەستوگێژم کە هەتا گاڵە بەجامی جەم کەم
ئێستە بۆ چارەیی خەم گۆشەیی مەیخانەیە جێم
من کەڕۆژێك دەمەویست میللەتەکەم بێ خەم کەم
چۆن نەبەم بۆ مەیو مەیخانە پەنا؟ تێ گەییوم
لەم وڵاتە هەموو شت زۆرە بەنی ئادەم کەم
تانەڕووخاوە بلاپڕ بێ لە خۆشیو مەستی

تازە پێی ناوێ کە من هۆدەیی خۆم مەحکەم کەم
پیرو زۆرهانمو ئێستەش دڵەکەم هەر دەیەوێ
سەرو ماڵم بەفیدای خاڵو خەتو پەرچەم کەم
داستانی مەمو زین کۆنە کچێکم گەرەکە
شلکە ڕانی بگوشم بۆنی لەسینگو مەم کەم
من لەجوانی دەگەڕێم تێپەڕە زستانی درێو
کچ کە ڕووم نادەنێ با سەیری گوڵو شەونەم کەم
شەڕەبایە لە چیاکانو هەوا تووشە دەنا
وەکو شێتان دەمەویست ڕوو لەچیای ئەستەم کەم
برای خۆشەویستم کاکە مەم: ئەوا جارێ شیعرەکانی مام هێمنم بۆ ناردی پەنا بەخوا بەهومێدم مەقالەکەشت زوو بۆ بنێرم، ئینشاڵڵا قاپە ماستەکانت وەرگرتوونەوە.
طبعا مام هێمنو مام عەلی سەلامت لێ دەکەن.

**برات: هەژار**
1970/11/23

## باوکی سۆران سەلام عەلێک

کاکە گیان کاك محەمەد عەی دوکانێکی لە هەولێر هەیە دەڵێن دەخرێتە مزایەدە بۆ خۆشی ئێستا وێنەگری پیشمەرگەیە لەناوپردان... نازانم چەندت پێ دەکرێ مساعدەی بکەی؟
لێم ڕوونە تۆ درێغی ناکەی...
عەبدولوهاب ئەتروشم دیتو گلەییم لێ کرد کە مستەفای دانەمەزراندووە.
سوێندی خواردووە کە دای دەمەزرێنێو قضیە منتهییە، بابچێتەوە لای بزانین چۆن دەبێ. لەو یەك دوو ڕۆژەش دا خۆم دێمەوە.

**برات: هەژار**
1971/4/23

*نامەکانی هەژار بۆ مەم لەکتێبی نامەکانی مەم بڵاوکراونەتەوە کە ئیسماعیل بەرزنجی ئامادەی کردووەو دەزگای ئاراس چاپی کردووە.



دانیشتوو: گیو موکریانی – له ڕاستهوه: 2- هەژار، 3-عەبدولخالق مەعروف



هەژار و زەبیحی- سەردەمی کۆمەڵەی ژ. ک



له ڕاستەوه: هەژار، 2، 3؟، 4-عەبدولکەریم قاسم، 5-مام جەلال، 6، 7؟، 8-زەبیحی



هەژار و مەم و هێمن



له ڕاستەوه: د. ئاسۆ، هەژار، ڕۆژنامەنووسی ئازەری ریوی خشکتابی –1350 هەتاوی



هەژار و د. ئاسۆ و هاوسەرەکەی



مەم و هەژار بە جلی کوردییەوە لەگەڵ کۆمەڵە کەسێکیتردا

# ساڵهاتی کۆچی دوایی مامۆستا هەژار

## دیدار لەگەڵ خانەوادەی هەژار

"گۆڤاری ئاوێنە لە ساڵیادی کۆچی دوایی هەژاری موکریانیدا ئەم دیدارەی لەگەڵ هەندێ لە ئەندامانی خانەوادەکەی کردبوو"

لە ژیانیا نەوەك لەگەڵ من بەڵکو لەگەڵ هەموو بەشەرێکی بەوەفا بوو، یانی ئێستا من دەبێنم هەژار زۆر لەوەی گەورەتر بوو، لە وەفاداریو لە زۆر شتی تردا میللەتی خۆی جوان ناسیبو، هەمیشە دەیگوت زۆر هەوڵی دەدەم ئەو میللەتە ئیحتیاجی بەخوێندەواریە. هەرچەندی خۆی ماندو دەکرد، ئەو پیاوە بۆ خۆی نەیدەزانی ماندووە، دەیگوت میللەتەکەم ئیحتیاجی بەکارهەیە هەمیشە دەیگوت لێم گەڕێن ئەمن ئیستراحەتم ناوێ، ئەبێ کار بکەمو خزمەت گوزاری گەلەکەم بم حوکومەتی بەعس لە عێراق،ماڵیان لێ داگیرکردین ماڵێکی زۆر خۆشمان هەبوو، پولێکی زۆرمان بەجێهێشت، جەواهیرێکی زۆر دوای ئەو کارەساتە نائینسانیە ئەمن زۆر مات بووم، وتی بۆ واماتی، وتم هیچم دەگەڵ خۆ نەهێناوە، نەتدی چ ماڵێکمان هەبوو، وتی نانا خەمی ماڵی دنیابێ مەخۆ، ئەگەر ئەمن بم هەموو شتێکمان دەبێ، ئەمن چەند جار ئاوارە بوومە، ئەگەر هاتینەوە ماڵمان پێکەوە حاڵمان باش بوو، بەمنداڵانی دەگوت رۆڵە بخوێننو هەموو رێگایەکتان هەر خوێندن بێ، ئەگەر مەمو زینی بخوێنی دەبینی چەند بۆ میللەتی خۆی وەفادار بوو، کە جوومە سەر قەبری لە مەهابادێ هەر جارێ دەم دیت زۆر کەس ئەوە هانونە لە ئێرانێ لە تورکیا لە عێراقی هەموی ئەوەهی دەستو قەڵەمی خۆیەتی، هەزار رەحمەتی لە گۆڕی ئینشاڵلا روحیشی شاد بێ لە قیامەتێ، زۆر زۆر دڵسۆز بوو، بۆ هەموو بۆ منداڵی بۆ ماڵی، رەفیقایەتی زۆر باش بوو، پیاوی تەواو بوو، ناتوانم تاریفی بکەم، ئەوەی دەزانن زۆر لەوەی گەورەتر بوو، قەت مەتلەبی ماڵی دنیاێی نەبوو، هی وابوو دەیان گوت وەرە کارت دەدەینێ، حقوقی چاکت دەدەینێ، دەیگوت ئەمە بۆ من نابێ، ئەمن ئەو کارەی ناکەم، ئەو پیاوەش ئەگەر وابوو رێیەکی گرت، هەوەل دەستو قەڵەمی دوایی ئەو رێگایەی لەسەری ئەڕۆیشت، لەو نەخۆشیەی بێهۆشیش دا دەیگوت زۆر دەترسم کەلەو بێهۆشیە نەتوانم کار بکەم، گوتم بۆ والە خۆت دەکەی؟ ئینسانیش نەخۆش دەبێ، گوتی نەخۆشیم پێ ناخۆش نییە، ئەگەر من نەتوانم کارێ بکەم، جائەگەر ئەمن نەتوانم بنووسم بەکەڵکی چ دیم؟



**ئاوێنە: مامۆستا هەژار چەند منداڵی هەیە.**

و: چواری هەیە، شێرکۆ، ئاگری (مستەفا)، زاگرۆس، خانی.

**ئاوێنە: ئێستا تەنیا کاک مستەفا لێرەیە.**

و: بەڵێ.

**ئاوێنە: ئەو مودەتەی کە مامۆستا هەژار پەڕیوەی وڵاتان بوو، دور لە وڵات بوو. ئەو مودەتەی ئێوە هەر لەگەڵیا بوون.**

و: بەڵێ ئەرێ وەڵلا، هەر لەگەڵی بووم، ئەو زۆر لە ماڵ نەبوو، ساڵێکی چووە سوریەی، ئەمن کوڕێکم هەبوو شێرکۆ، 11 ساڵی بوو، لەگەڵ ئەو کوڕەی بووم بۆ خۆم لە بەغدایی ئەمنو ئەو مستەفایەی کەلەگەڵم دایە ئەویش یازدە مانگ بوو کە بابی ڕۆیی بوو، رۆیشتە سوریەی، ئەو دەم عێراق لە دەستی رژێمی پادشایەتی دابو چووە وێو لەگەڵ منداڵەکانی، ساڵێکو چەن مانگان لەوێ ماینەوە، ئەگەر کودەتا کرا لە عێراقی گەڕاینەوە لەوێ زۆر کاری هەبوو، دوکانی عەکاسیشی دانابوو لە مەجمەعی عیلمیش، هەفتەی دو جاران کۆبونەوەیان هەبوو.

**ئاوێنە: بێگومان ئێوە کە شەریکی ژیانی مامۆستا هەژار بوون، شوێنێکی زۆرتان بووەو هەر کوردێک سپاسگوزاری ئێوەیە، هیوادارین کە سەلامەتو تەندروست بنو ئینشاڵڵا کورەکان خودا بیان پارێزێو بتوانن ئەوانیش بەو رێگایە کە هەژاری رەحمەتی چووەو خزمەتی بەمیللەتی خۆی کردووە، ئەوانیش خزمەت گوزاری گەلەکەیان بن، مەجەلەی ئاوێنە کە مونتەشیر دەبوو لەگەڵ مامۆستا هەژارا موساحیبەی کرد، نازانم ئاگاتان لەوە بووە یان نە، ئایا مامۆستا هەژار سەبارەت بەگۆڤاری ئاوێنە بیروڕای خۆی دەربڕیوەو ئایا باسێکی کردووە، قسە کراوە سەبارەت بەگۆڤاری ئاوێنە یان نە؟**

و: وەڵلاهی لە نوسینی خۆی نەمدیتووە بەڵام زۆری پێ چاك بوو یانی نەك گۆڤای ئاوێنەو سروە ئەمن پێم خۆشە هەر چۆنێك بێ

نووسینی کوردی هەبێ، هەر کەسێك دەبێ زمانی خۆی بزانێ و دەیگوت هەر چۆنێك بێت ئەمن نوسینی کوردیم پێ چاکە پێیان دەگوت ئێمە کوردی باش نازانین دەیگوت ئێوە زۆر بنوسن کوردی فێر دەبن، هەر خەراپیش بێ لەوەی چاکترە کە نەزانن، ئەمن بۆ خۆم نووسینێکم نەدیتوە بەرامبەری ئاوێنە بەڵام زۆری پێ چاك بوو، مەجەلەی ئاوێنە، مەجەلەی سروە، ئەوانەی پێ چاك بوو، دەیگوت ئوانەم پێ چاکە زۆر شتی چاکی تێدایە ئەوجا بێجگە لەوانە هەر دەیگوت کورد ئەبێ تادەتوانی بنوسی ئەوە شتێکی زۆر چاکە، زمانەکەی خۆی لەبیر نەچێتەوە، بەزمانی خۆی بنووسێ.

**ئاوێنە: کاك مستەفا گیان سەرەخۆشیت پێ دەڵێم لەلایەن خۆمو هەموو هاوکارانی گۆڤاری ئاوێنەوە هەڵبەت دەبێ سەرەخۆشی بەنەتەوەی کوردو هەموو بیر ڕوناکانی جیهان بڵێین کە مامۆستا هەژار کۆچی دوایی کردووەو ساڵێک بەسەر ئەم موسیبەتە تێپەڕی، ئێستا بۆ گۆڤارەکەمان کە هاتوینەتە خزمەتتان سەبارەت بەمامۆستا هەژار باسمان بۆ بکە، جائەمن چەند پرسیارێکم هەیە پێش لەوەی داوا دەکەم ئەگەر خۆت شتێک هەیە بیڵێی؟**

و: وەڵڵاهی پێموایە ئەوەی لەمەر باوکم بوو دایکم باسی کردو هەمووی بۆ گێڕانەوە، لە منداڵی پێش ئەوەی بچمە مەدرەسە مەمو زینی خانیم دەخوێندەوە. تێنەدەگەیشتم هەڵەکانی بۆ ڕوون دەکردمەوە، ئەو پێی وابوو دەبێ زمانی کوردی پێش هەموو شتێك باش فێربێ، دوای وی زمانی عەرەبی، لە بێخولان بووین لە کوردستانی عێراق، موعەللەقاتی سەبع کە بەناوبانگترین ئەدەبیاتی عەرەبی، جاهلیەتی پێش ئیسلامەو سەرچاوەی شیعرەکانی عەرەبییە ئەو شیعرانەی پێ دەرك دەدام. پاش ئەوە هاتمەوە هەر هانی دەدام قورئانی فێربم، دەیگوت قورئان بەرزترین ئەدەبیاتی عەرەبو ئیسلامەو ئیدی هەروا هانی دەدام شت فێربم، شت زیاتر فێر بم، کەباسی قورئانم کرد باوکم ئیمانی بە بەزەیی خودا بوو پێی وابوو خودا هەر ڕەحمەتەو ئەو فکرەشی پێم وایە هەر لەخانی وەرگرت بوو، لەمەمو زینی خانی کە ئینسان بیخوێنێتەوە خانی ئیمانی بەوەیە کە خودا تەنیا ڕەحمەتەو غەزەب نیە.

**ئاوێنە: کاك مستەفا، ڕەحمەتی مامۆستا هەژا کتێبی زۆرە، چ ئەوەی خۆی نووسیویە چ ئەوەی تەرجومەی کردۆتە سەر زمانی کوردی، یا فارسی، ئەگەر جەنابت کە نزدیکترین ئەولادی بووی و هەمیشە پێکەوە بوون لات وایە، کام کتێب لای مامۆستا هەژار خۆشەویست تر بووە؟**

و:وەڵڵاهی نازانم کتێبەکانی هەموولا خۆشەویست بوو، مەمو زینی خانی زۆر پێ خۆش بوو. جارێکی کردیە موکریو جارێکیش لە ئەوروپا چاپ بوو یانی کە لیماتەکانی لێ نووسیو شەرحیداو نەی کردە شیعر، مەلای جزیری هەروا، پێموایە هەمووی لای زۆر خۆشەویست بوون، قورئانەکە کە ئەویش سەرچاوەی ئەدەبیاتی جیهانەوە و پێوایە ئەگەر قورئانەکەی پێ چاپ کرابا ئەوی پێ لە هەموان باشتر دەبوو.

**ئاوێنە: کاك مستەفا جەنابت ئێستا کارت چیەو چی دەکەی.**

و: ئەمن ئێستا کارمەندم یانی فەرمانبەرم لە ئیدارەی رادیۆی بەشی کوردی، کاریشم ویراستاریە بە فارسی پێموایە بە کوردی دەبێتە هەڵەگر، ئەو بەرنامانەی کە دەینووسنەوە ئەمن لەباری کوردیەوە راستی دەکەمەوە.

**ئاوێنە: بە ناوی باوکێك کە جەنابتی تەربیەت کردووە، راسپاردەو تەوسیەی چی بوو، کە تێبکۆشیتو خزمەت بکەی بە کۆمەڵ.**

و: بەڵێ، هەمیشە ئیمانی بەوە هەبوو کە دەبێ ئینسان لەسەر پێی خۆی راوەستێ، ئەمن یەك دوو ئیشم گۆڕی لە ژیانم دا، هەمیشە تەوسیەی پێدەکردم کە دیگوت کوڕم تۆ لە ئیشەکانت دیققەت بکە، ئەمن نامێنم بۆ ئێوە، ئەمن هەر دەمرم ئێوە دەمێننەوە، ئێوە دەبێ فێربن لە ئێستاوە لەسەر پێی خوتانەوە راوەستن نانی خۆتان بە دەستی خۆتان پەیدا کەن.

**ئاوێنە: لە بارەی خوێندنەوە چی؟**

و: خوێندن وەڵڵاهی هەر دەگوت دەت نێرمە ئەوروپا، هەر ناردمیشیە ئەوروپا، ئەما وابوو لەبەر چەند زروفێك ئەمن هاتمەوە، ئەو سێ براکانی دیکەشمی ناردە خارج باوەڕی وابوو ئەوروپا زۆر پێشکەوتووە لە بارەی زانست کە ئێمە بنێرێتە وێو فێری عیلمو زانست بین و بێینەوە و خزمەت بە گەلەکەمان بکەین.

**ئاوێنە: کاك مستەفا بۆ خۆت چ پەیامێکت هەیە بۆ گۆڤاری ئاوێنە و ئایا گۆڤاری ئاوێنەت چاو پێکەوتووە؟**

و: بەڵێ چاوم پێکەوتووەو گۆڤارێکی زۆر باشەو ئومێدەوارم هەمیشە سەرکەوتووبن ئەندامەکانی، نووسەرەکانی، ئینشاڵڵا سروەو تەواوی گۆڤارەکانی دیکەش سەرکەوتووبن.

**ئاوێنە: کام مستەفا مامۆستا هەژار لە زمانی عەرەبیا شارەزایەکی تەواوی هەبوو، بە فەرهەنگی ئیسلامی و قورئانیش بێگومان زۆر ئاگای بووەو هەر بۆیەش قورئانی کردۆتە کوردی و هەروەها کە خانمی دایکتان فەرموویان مەبەستی زۆرتری ئەوە بوو، کە کورد زمان باش لە قورئان تێبگات، تەنیا خوێندنەوەی نەبێت بەڵکو ماناکەشی تێ بگاتو جا جەنابت کە کوڕی مامۆستا هەژاری لەو بارەوە بۆ ناسینی فەرهەنگی قورئان چیت کردووە.**

و: وەڵڵا من بابم دەیفەرموو وەقتی من فەقێ بووم 5(جزم) ی قورئانم لەبەر بووە، 5(جزم) کەم نیە ئەمنیش هەر لەسەر ئەو پێیە هەستام، سێ جزء و شتێکم لەبەرە، قورئان لەبەرکردن بۆ خۆی بە تایبەت ئەگەر ماناکەشی بزانی، زۆر باشە قورئان لەبەرکردن فێرت دەکا کە هەڵوێستەکی تایبەتی لە ژیاندا بگری یانی زۆر گوێ نەدەیە دونیا هەمیشە بۆ ئاخیرەت هەوڵ بدەی نوێژ بکەی، ڕۆژوبگری، تاعەت بکەی، پەیرەوی ئیسلام بی، ئەو شتانەی تێدایە قورئان یانی ڕێگای ژیان پێموایە ڕێگای ژیانە بۆ هەر موسوڵمانێك.

**ئاوێنە: زۆر سپاست ئەکەین هیواداریین هەر سەرکەوتووبی.**

# بۆچی مردوو لینگی درێژ دەبێتەوە



زۆر لەمێژ ساڵە لەناو کوردەواری خۆماندا پرسیارێك دەماودەمو دەستاودەست دەکا، کە ئاخۆ بۆچی نووسەرو شاعیرو هونەرمەندەکانمان تا زیندوون کەس ئاوڕیان لێ ناداتەوە کەس بەهیچین نازانن. کەچی کەدەمرنو لەدەست دەچن دەگەڕێنەوە سەریانو شینیان بۆ دەگێڕنو کۆڕی شەپۆڕیان بۆ دەبەستنو چاکیان پێ هەڵدەڵێنو خۆشیان دەربارە دەبێژنو فرمێسکی گەرموگوڕیان لە دوو هەڵدەڕێژن؟

لەڕاستیدا پرسیارەکە تا ئێستا بێ وەرام ماوەتەوەو هەریەك بەجۆرێك لێکی داوەتەوە، من لام وایە کوردیش وەك هەموو کەسی تر دەزانی بێ شیعر ناژی، چیرۆکی چاکی بەلاوە خۆشو پەسندە... بەڵام بەو مەرجە کە بەخۆڕایی دەستی کەوێو بیبیسێو زیانی ماڵی لێ نەکەوێ...

شاعیرو نووسەر دەبێ کاتو ساتی بۆ نووسینەکە تەرخان کاو ئەویش وەك هەموو ئافەریدەیەك خواردنو لانەی دەوێو ئەبێ ژیانی ڕۆژانەی پەیدابێ، ئەمجار بۆ ڕەنێوهێنانی بەرهەمەکەشی ناچارە داوای یارمەتی لەمو لەو بکا.. ئەمەش بۆ ئەو ئەمو ئەوە دەری ناهێنێو کابرای خاوەن پارە با حەزیش لەشیعر بکا بەڵام حەز لەپارە پتر دەکاو شیعری بەخۆڕایی پێخۆشترە لەوەی کەبیکڕێ.!!

جا بۆ ئەوە لەو نیازو مەبەستەیدا سەرکەوێ دەست دەکا بەخراپە گوتنو ڕەخنە لێ گرتن، ئەو شاعیرەی کە ڕەنگە کاری بکەوێتە لایو بەو فێڵە ڕژدیو چنۆکی خۆی پینە دەکا...

بەڵام ئەگەر ئەو شاعیرە یان ئەو نووسەرە مرد "وەك دەڵێن مانگا مرو دۆ بڕا" تازە داوای هیچ لەکەس ناکاو ئەوی لەژیانا کردوویە بەبێ نرخ بژاردن بۆ هەموو کەس ماوەتەوە. ئەوسا هەموو کەس بەبێ ترس لەزیان دەتوانێ بڵێ: زۆرم خۆشدەویستو خۆشم دەوێو چاکی گوتووەو زۆر بەر دڵم دەکەوێو نووسەرێکە هەرگیز نامرێو ئەگەر بەزیندوویی کۆڵیتێکی نەبوو ئێستا وا لەناو دڵماندا دەژیو جێگای زۆر گەرمو خۆشەو هەموو دنیا بۆی بەپەرۆشەوەیە!!.

ئەوجار هەر ئەو پیاوە مەردە بادەداتەوە سەر زیندووەکانو گەڕ دەو نووسەرەانە دەهاڵێنێ کە هێشتا دەمیان دەجوولێو خواردنو بەرگو خانوویان دەوێو چاویان لێ دەقوونجێنێ دەمیان لێ دەکاتەوەو بەجڕوجونگو خشتوخاڵیان ناو دەباو پاڵیان پێوە دەنێ.

بەکورتیو بەکوردی ئەگەر وردی لێك دەینەوە دەزانین کە ئاکارێکی زۆر نانەجیبانە ملی گرتووینو دەمانەوێ شاعیرو نووسەرمان دڵمان خۆشکەنو ئامۆژگاریمان بکەن. بەڵام نۆکەری بێ خەڵاتو بەراتمان بن.

حاجی قادرمان بەپێخواسیو بێ چۆغەو کاڵەك لە باڵەك سووڕاوەتەوەو سەرباری ئەوەش خەڵکی کۆیە شاربەدەریان کردووەو بەکافرو پیاو خراپیان داناوە، خەڵکی سولەیمانی نەدەچوونە نەوروزێك کە پیرەمێر بۆی ساز دەکردنو هەزار درۆو بوختانی بەختو خۆڕاییان بۆ هەڵدەبەست، بێکەس لێفەیەکی



نەبوو بەخۆیدادا دەچوونە سەیری قڕەی خۆیو خێزانی لەسەر لێفە بەڵام کەس نەبوو دەست بەرێ پارەی لێفەیەك بدا.

گۆران ئەگەر لەبەندیخانەدا نەبوایە دەبوایە ڕۆژهەڵاتو ڕۆژاوای بۆ نانی ڕۆژانەی بپێوایە، گوایە ئەو ڕۆژگارە کەس نەبووە لەشیعر سەری دەرچێو تامی هونەر بکا؟ بەڵێ هەبوو بەڵام وەك گوتم ئەگەر بیان گوتایە ئێوە باشن دەبوایە یارمەتیشیان بدەن جا بۆ ئەوە خۆیان لێ بدزنەوەو بۆیان ماندوو نەبن بڕوبەهانەیان پێ دەگرتنو خۆیان لە چنگ ڕزگار دەکردن.

لە زەمانی ئەواندا شاعیرو نووسەری پێش ئەوانیان هێناوەتە پێش چاویانو ناویان بەڕێزەوە هێناونو ڕاوەستاون تا یەکێك لەو زیندووانەش مردووەو ئەوسا گورج هەستیان بەبلیمەتیو گەورەیی ئەویش کردووەو گوتویانە: ئەشەدەم بیللا شاعیرێکی گەورەو نەمر بووەو ئەونەی ئێستا ماون خوێڕیو تۆڕینو بۆ ئەوەنابێ پیاو بیان ناسێ.

حاجی قادر پێغەمبەری کوردایەتیمانەو پیرەمێرد گەنجینەی ئەدەبیاتی بۆ جێ هێشتینو بێکەس دەرسی ئازایەتی دەداینو گۆران دەسکە گوڵی سەر سەبەتەی ئەدەبیاتی کوردەو پێویستە کۆتەڵیان بۆ بڕازێنینەوەو پەیکەریان بەرز کەینەوەو شینیان تازە بێتەوەو ئاکاریانو کرداریان لەبیر کورد نەچێتەوەو لەلای بێگانەو خۆ شانازییان پێوە بکەین!!؟!

ڕۆژێك لە بەغدا بەبەر دوکانێکدا ڕادەبردم. چەقەڵێکی مردووی مۆمیایی کراوی لێ دانرابوو، لەسەر نووسرابوو: نرخی 25دینارە، سەری زمانی خۆم گەست، ئایا دەبێ ئەو چەقەڵە بەزیندوویی شاعیر بووبێ؟... ئەگەر شاعیریش بووبێ چەقەڵی کوردستان بێ... چەقەڵ بەزیندوویی پەنجا فلسێك ناکا ئەگەر مردو مۆمیایی کرا نرخی 25دینارە!؟.

ئای سەد خۆزگە ئەم گەلە نەجیبەمان لەو ئاکارە نانەجیبانەیەشی ڕزگاری دەهاتو وای لێ دەهات بەبێ لەڕوودامان بەچاکی بوگتایە چاك جا با زیندووش بوایە، قامکی دەچاوی خراپ ڕابکردایە جا با مردووی مۆمیا کراویش بوایە. خوا گەورەیە... هیچ دوور نییە ئەو ڕۆژەش بەچاو ببینین کە بەزیندی سەر، کورتەباڵاو درێژن لێك جیاکەینەوەو هەر بەمردوویی لینگی هونەرمەندانمان لەبەریەك نەکێشینەوە، بەهومێدی ئەو ڕۆژە.

*ئەم بابەتەی مام هەژار لەگۆڤاری (هەولێر)ی حەفتاکاندا بەپچڕپچڕیو ناڕێکی بڵاوکراوەتەوە، دواتر لەکتێبی (نامەکانی مەم) بەم شێوەیەو بەڕاستو دروستی بڵاوکراوەتەوە.





# کوردستان

کوردستان ئەی نیشتمانم      هێزی دڵ، ئارامی گیانم
جێی سەربڵندیو شانازی      تادڵ دەخوازێ: دڵخوازی
گوڵی پشکتوی بێ پاییز      سیس نابێو ناوەرێ هەرگیز
مێشکم، هەستم، بیرم، ژینم      بۆ تۆن ئەی گیانی شیرینم
تازیندوم هەر تۆی مەبەستم      خۆشم دەوێی، دەت پەرستم
بشمرم لەشی بەگڵ بوو      دەڕوێنێ چەند گوڵو دڕوو
گوڵم بۆ دەستی دڵدارت      چقڵم بۆ چاوی بەدکارت
گیانیش دەفڕێتە عاسمانت      ئەوسا تێر دەکا سەیرانت

*ئەو شیعرانە لە ڕوپەر 38ی بۆ کوردستانەکەدایە.